# میژوو ٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات





ژمارە 24
ساڵی شەشەم
پایزی 2012



# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات





ژمارە (٢٤) سالی شەشەم پایزی ٢٠١٢






**هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بڵاودەبنەوە نوسەرەكانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت كە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە**

* گۆڤار : مێژوو

* ژمارە : (٢٤)

* تیراژ : (٥٠٠) دانە

* چاپخانە : رۆژهەڵات

كوردستان / هەولێر - كۆڵانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر
g.mezhu@yahoo.com
g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## سەروتار



## توێژینەوە



## القسم العربي

## ◄ کەشکۆڵی گۆڤار

# بۆ مێژوو.. هەولێر پایتەختی ڕۆشنبیریی کوردستانە

## سەروتار

هەولێر کۆنترین شاری کوردستانە، ئەمە ڕاستیەکە هیچ گومانی لێناکرێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا گرنگی شارەکە بەدیاردەخات بەتایبەتی کە شار بایەخێکی زۆری لە شارستانییەتدا هەیە.

لە پێش زایین پایتەختی شانشینی (حدیاب) بووە، لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەتابکیەی اربیل یان میرنشینی اربیل(هەولێر) بایەخی ئەم شارەی لە لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامی بۆ نەخشاندووین بە شێوەیەك وایکردووە هەولێر لەو سەردەمدا نەك لەسەر ئاستی مێژووی ئیسلامی بەڵکو لەسەر ئاستی مێژووی جیهان ناسراوبێت.

ماوەیەك پایتەختی میرنشینی سۆران بووە. بوونی شارە قەڵا لە شارەکەدا تایبەتمەندی داوە بە هەولێر کە لە هیچ شارێکی کوردستان تەنانەت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاوشێوەی نەبێت، ئەوەی جێگای سەرنجە ناوی هەولێر تەنیا لە لایەن کورد بۆ شارەکە بەکاردێت و عارەب و تورکمان اربیل بەکاردەهێنن تەنانەت ئاشورییەکان و لە نووسینی ئینگلیزیش اربیل بەکاردێت.

منارەی چۆلی تایبەتمەندیەکی تری شاری هەولێرە کە گەواهیدەری پێشکەوتنی شارستانیەتی شارەکەیە لە سەدەکانی ناوەڕاست. ئەمانە هەمووی پێشینەی مێژوویی شارستانی و ڕۆشنبیری شارەکە ڕوون دەکەنەوە.

لەگەڵ بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ هەولێر بووە پایتەختی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان سەرەڕای لایەنی سیاسی هەولێر لە ١٩٧٠-١٩٧٤ لە ڕووی ڕۆشنبیریی پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینیوە، هەروەها لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە بە پایتەختی هاوینەی عێراق داندرابوو ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبوو بەسەر پەرەسەندنی بارودۆخی ڕۆشنبیریی لە شارەکەدا.

لە سەرەتای نەوەدەکانەوە لەگەڵ دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان هەولێر بە فەرمی بە پایتەختی هەرێمی کوردستان داندرا ئەمەش ڕۆژ دوای ڕۆژ کاردانەوەی بەسەر ڕەووشی ڕۆشنبیریی شارەکە بە لایەنی ئەرێنی هەبووە. ئەمڕۆ حکومەت بەسەرجەم وەزارەتەکان بە وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە لە هەولێرن، بەرزترین دەزگای زانستی کوردستان ئەکادیمیای کوردی لە هەولێرە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بارەگایان لەم شارەیە قونسلیەو سەنتەری ڕۆشنبیری وڵاتان بارەگایان لەم شارەدایە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامەی گرنگ و ڕادیۆو تەلەفزیۆن و لە پایتەختەوە بڵاودەکرێنەوە و پەخش دەکەن. لە پاڵ چەندین چاپخانەی حکومی پەیتا پەیتا ژمارەی چاپخانە ئەهلییەکان لە هەولێر پتر دەبن.

گەورەترین زانکۆ لە کوردستان لە ڕووی ژمارەی کۆلیج و بەشی زانستی و پلەی زانستی مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەددینی هەولێرە ئەمە سەرەڕای ئەوەی ژمارەی زانکۆ ئەهلییەکان لە هەولێر لە هەر شارێکی تری کوردستان پترە.

بەرزترین ئاستی خوێندەواری لە شارەکانی کوردستان لە پایتەختە، ئەمانە هەموو ئەو پێوەرانەن کە بە دیاری دەخەن ئەمڕۆ هەولێر نەک هەر پایتەختی سیاسی بەڵکو پایتەختی ڕۆشنبیریی کوردستانیشە. کاتی ئەوەش هاتووە بە پێوەر و ئامار و داتا و لۆژیك بنووسین و بدوێین، هەروەها دەتوانین بڵێین کە

هەولێر نەك هەر پایتەختی ڕۆشنبیریی كوردستانی عێراقە، بەڵكو پایتەختی ڕۆشنبیریی كوردستانی گەورەیە، چونكە ئەو بزووتنەوە ڕۆشنبیرییە پەرەسەندووەی لە هەولێر هەیە لە هیچ شارێكی تری پارچەكانی تری كوردستانیش بوونی نییە.

ئەگەرچی هەولێر بە شاری قەڵاو منارەو هۆلاكۆ بەزێن ناسراوە بەڵام پێمان وایە باشترین پێناسە بۆ هەولێر بریتییە لە(شاری ڕۆحانییەت، عەقڵانییەت و شارستانییەت).

# فەلسەفەی مێژوو لای ئیبن خەلدون

پ.ی.د.ئاکۆ برهان محمد/بەشی مێژوو - ز. سەلاحەددین

## یەکەم/ ژیاننامەی ئیبن خەلدون و بنەما هزریەکەی:

لە ساڵی ١٣٣٢ لە وڵاتی تونس لە دایك بووە و هەر لە منداڵیەوە تا تەمەنی بیست ساڵی تەواوی خۆی سەرقاڵکردوو بە بەدواداچوونی خوێندن و زانست و زانیاریەو بەتایبەت لە زانستە ئاینیەکان و زمانەوانیەکان و فەلسەفەو بیرکاریەوە، هەروەها نزیکەی بیست ساڵی تری تەمەنی وەکو فەرمانبەرێکی حکومی کاری کردووە لەژێر سایەی میرنشینەکانی باکوری ئەفریقاو ئەندەلوس(ئیبیریا)، پاشان ماوەی بیست و چوار ساڵیش لە میسر ژیانی بەسەر دەبات و کاری مامۆستایەتی و دادوەرێتی ئەنجام دەدات[1].

ئیبن خەلدون خولیایەکی زۆری هەبووە بۆ وەرگرتنی زانیاری و هەمیشە ڕێزی مامۆستایانی دەگرت و پابەندی بیروڕاکانی ئەوان بووە، بەڵام کە لە ساڵی ١٣٤٩ وڵاتی تونس تووشی نەخۆشی ڕشانەوە دەبێت و ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان تووشی نەخۆشی و لەناوچوون دەبن لەوانە ژمارەیەکی بەرچاوی زاناو مامۆستایان و بەشێکیشیان کۆچ دەکەن بۆ وڵاتانی دیکە، ئەمەش دەبێتە مایەی بێزاری و نیگەرانی و تاوای لێهات ڕامان و شرۆڤەی بارودۆخی ژیان بە وردی بکات تا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم کارەساتە پاڵنەرێکی سەرەکی دەبێت لە گەڵاڵەکردنی ئایدیای هزری تایبەت بە خۆیەوە دەربارەی ڕێڕەوی مێژوو و گۆڕانکاریە مێژووییەکان، هەر لەبەر ئەمەش لە دیارترین بیروبۆچونەکانی ئەو

دەربارەی لێکدانەوەی مێژوو بریتییە لە ڕۆڵی ڕواڵەتە سروشتیەکان و گۆڕانکاریە جوگرافیەکان لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، جگە لە تێکەڵبوونی لەگەڵ ژیانی کۆچەرێتی باکوری ئەفریقا ئەمەش بووە هۆی فراوانکردنی زانیاریەکانی دەربارەی ژیانی کۆچەرێتی و پێڕەوو نەریت و ڕەفتاریان و هەڵسوکەوتەکانیان دەربارەی ژیان، بەم جۆرەش گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی(دەمارگیری) لادروست دەبێت کە ئەم دەمارگیریەش چ ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە دەوڵەتدا.

ئەم چوار ساڵەی کە لە شاری(تلمسان) جەزائیری ئێستادا نیشتەجێ دەبێت لە کۆشکی یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی تەواو یەکلادەکاتەوە بۆ نووسین و دانانی کتێب، دەست دەکات بە نووسینی کتێبە بەناوبانگەکەی دەربارەی مێژوو لەژێر ناونیشانی (العبر وديوان المبتدأ والخبر في أيام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر)، بۆ ئەم کتێبەشی پێشەکیەکی زل دەنووسێت لەژێر ناونیشانی(المقدمة) کە کتێبێکی تایبەتەو جەخت لەسەر زانستی مێژوو دەکاتەوە لەگەڵ فەلسەفەی مێژوو و کۆمەڵناسی، ئەم کتێبەی ئەوپەڕی فراوانی هزری ئیبن خەلدون دەگەیەنێت و ئاوێنەیەکە بۆ توانستی فیکری و ئایدیا بەرفراوانەکانی ئەو دەربارەی زۆر لە بوارەکانی ژیان، کاتێك خوێنەر کتێبەکەی (المقدمة) دەخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات نووسەرەکەی لە چ ئاستێکی کراوەیی هزریدا ئەم کتێبەی داناوەو تا چ ڕادەیەك ئاستی ڕۆشنبیری بەرزە و ماریفەو زانیاریەکی بەرفراوانی هەیە.

پێویستە بگوترێت ئەزموون و شارەزایی ئیبن خەلدون دەربارەی ژیان بە گشتی و چڕبوونەوەی هزری خۆی لەبوارە زانستیەکان و لە لایەکی تریش چوونە نێوکاری سیاسی و کارگێری لە باکوری ئەفریقا، جۆرێك لە ململانێی بۆ دروست دەبێت لە هەر دوو بوارەکانی سیاسی و زانستیدا، ئەمەش ڕۆڵی دیاری دەبێت لە

چاندنی تۆوی تەمامی ئاستبەرزی فیکری خۆی و بەرجەستەبوونی فیکری مێژوویی خەلدونی بە سوود وەرگرتنی لەم هەموو ئەزموونەی کە تیایدا بووە[٢].

کەسێتی ئیبن خەلدون لە دوو لایەنەوە گەلآلە دەبێت، یەکەمیان: پێگەیشتنی زانستی، چونکە ئەو لە بنەماڵەیەکی زانستی و ئاینی هاتوتە کایەوە بەتایبەتی باوکی مامۆستای یەکەمی ژیانی زانستی بووە، دووەمیان خولیایی بۆ گەشت و گەڕان، ئەمەش وای بۆکردووە کە زیاتر ئاشنایی پەیدا بکات دەربارەی ژیانی کۆمەڵگەی جیاجیاو چۆنیەتی ژیان بەسەربردن و گەشەسەندن و گۆڕانکاریەکانیان، جگە لە ئارەزووبوونی بۆ کاری سیاسی و دانیشتن لەگەڵ میرو پاشایانی ناوچەکانی تونس و تلمسان و فاس و غەرناتە و خەڵکی ناوچەکانی بیابانی گەورەو میسر و شام و چاوپێکەوتنی لەگەڵ(تەیمور لەنگ) سەرداری مەغۆل[٣].

وە ڕاسپاردنی لە لایەن تەیمور لەنگەوە بە دانانی کتێبێك دەربارەی وڵاتی مەغریب ئەویش هەروەکو خۆی ئاماژە دەکات کتێبۆکەیەکی بۆ دانا[٤].

## دووەم/ کتێبی( المقدمة ) و هزری زانستیی مێژوویی:

ئیبن خەلدون گرنگیەکی زۆری داوە بە زانستی مێژوو و فەلسەفەی مێژوو[٥]، جگە لە گرنگیدانی بە بواری ژمێریاری و کتێبێکی بۆ ئەم مەبەستە داناوە لە ژێر ناونیشانی(الحساب)، کتێبێکی تریشی دەربارەی لۆژیك لەژێر ناونیشانی(المنطق)و جگە لە کتێبی تری وەکو(شرح البردة) و (شفاء السائل لتهذیب المسائل)، بەڵام ئاوێنەی هزری زانستی مێژوویی ئەو لە کتێبەکەی (المقدمه)دا دیاردەکەوێت، ئەم کتێبەی ئەو زیاتر لە هەموو کتێبەکانی تری شۆرەتی بۆ پەیداکردووە، چونکە دەربارەی ماریفەی جیاجیا دەدوێت بەتایبەتی زانستی مێژوویی و کۆمەڵناسی و سیاسیی و ئابووری و جوگرافی و هی تریش[٦].

ئـەم کتیبـەی بـووە تـەختی سـەرنجی توێـژەرو خوێنـەران و توێژینـەوەی جیاجیای لەسەرکراوە، گرنگیەکەی هەروەکو خۆی ئاماژە دەکات ئامانجی ئـەوە ڕووداوە مێژووییـەکان شـیکاری و تێگەیـشتن و ڕاڤـەی بـۆ بکرێـت و ڕاسـتی و دروستی تیادا ئاشکرا بکرێت و بخرێتـە چوارچێوەی ڕامـان و هزریـی قوڵـەوە و پێوەری شیاوی بۆ بهێنرێتـەوە، هـەروەکو نموونـەی یـەکێك لـەو پێوەرانـەی کـە خۆی ناوی دەبات بـە (زانـستی ئاواکـاری مرۆڤایـەتی) و هـەروەها پێـوەری تـری وەکـو فەلـسەفی و لـۆژیکی و ئـابووری و جـوگرافیی و کۆمەڵناسـی، هـەر لەبـەر ئەمەش هزری ئەو تێکهەڵکێشیەکی بەرفراوانی تێدایە و هەندێك پێیان وایـە ئـیبن خەلدون زانای کۆمەڵناسیەو هەندێکی تر زانـای ئـابووری سیاسـییە هەنـدێکی تـر فەیلەسوفی مێژووە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەو لەبنەچەدا مێـژوونوس و فەیلەسـوفی مێژووە زیاتر لە هەر شتێکی تر بووبێـت. لەبـەر ئـەوە هـزری زانـستی مێـژوویی دیاردەخات و دەیەوێت لە کتێبەکەی (المقدمة) پێمان بڵێت کە پێویـستە ڕێبـازی شیاو دابنرێت بۆ تێگەیشتنی مێژوو، بەتایبـەتی جـەخت کردنـەوەی لـە پێـوەری (تیۆری دەمارگیری)ئەم تیۆرەشی لە دیارترین بنما هزریە زانستیە مێژووییەکانی ئـەو دەژمێردرێـت، بـە ڕادەیـەکی زۆر پـشتی پـێ بەسـتووە لـە دیارخـستنی بیروباوەڕەکـانی دەربـارەی گۆڕانکاریـە مێژووییـەکان، لـەم کتێبەیـدا هەوڵیـداوە ئـەوەمان بـۆ دیاربخـات کـە هۆکـاری دروسـتبوونی دەوڵـەت چـین؟ چـۆن پـێش دەکـەوێت؟ چـۆن دوادەکـەوێت؟ چـۆن دەڕووخێـت؟ چـۆن دەسـەڵاتدار سەرهەڵدەدات؟ چۆن دوادەکەوێ؟ یـان چـۆن دەڕووخێـت؟ جگـە لـە باسـەکانی ئاوەدانی شارەکان و چۆنیەتی بەرفراوانی بوونیان و ڕۆڵی بوارەکانی جوگرافیایی و ئابووری و سەربازی لە مێژوودا[٧].

## سێیەم/ مێژوونووس لای ئبین خەلدون:

ئبین خەلدون دەیەوێت ئاگاداری و ئامۆژگاری مێژوونووسان بکاتەوە لەم هەڵانەی کە تێی دەکەون و هەواڵ بە نادروست دیاردەخەن یاخود دەکەونە نێو خورافاتەوە یان بەبێ شیکاری و لێکۆڵینەوە ڕووداوەکان تۆمار دەکەن، ئەم فاکتارانەی دەبنە هۆی دوورخستنەوەی مێژوونووس لە ڕاستیە مێژووییەکان و دیارخستنی بابەتەکان وەکو خۆی بریتین لە:

١- بە ئاسانی نەکەوێتە ژێرکاریگەری هەواڵی پەرش و بڵاو و پڕوپاگەندەکانەوە، بەڵکو لەسەری پێویستە پشکنین و لێکۆڵینەوەی وورد بۆ سەرجەم بیروڕاکان و هەواڵەکان بکا بۆ ئەوەی لە ڕاستی و دروستی مێژوودا یەکبگرێتەوە.

٢- پشکنین لە کەسێتی ئەوانەی زانیاری مێژووییان لێ وەردەگیرێت بۆ ئەوەی زانیاریەکان تەواو دروست بێت لەگەڵ ڕاستی مێژووییدا.

٣- دەبێت مێژوونووس ئاگاداری ئەوە بێت کە ئەم زانیاریانەی لە کەسانی تر وەریدەگرێت لەوانەیە کەسەکە مەبەستێکی دیاریکراوی هەبێ و ئەو زانیاریە بە تەواوی باس نەکات یا بیشێوێنێت لەبەر ئەوە لەسەر مێژوونووس پێویستە هەڵوەستە بکات لە بارەی زانیاریە مێژووییەکانەوە.

٤- نەبوونی زانیاری پێویست دەربارەی ڕاستی ڕووداوەکان وا دەکات بە ئاسانی زانیاری لە خەڵك وەرگرێت، بەڵکو دەبێت خۆش باوەڕ نەبێت هەر کەسێ چی ووت و ئەویش تۆماری بکا بێ ئەوەی ڕووداوە مێژووییەکە هەڵبسەنگێنێت.

٥- ئاگاداربوونی مێژوونووس لەم هەواڵانەی ستایش و بەسەرهەڵدانی تیادایە بۆ خاوەن پۆست و لێپرسراوان و گەورە پیاوانی دەوڵەت، چونکە لەوانەیە کەسەکە بە مەبەستی بەخشش و پارەو پولەوە ستایش دەکات.

٦- لە هۆکارەکانی تری کە مێژوونووس لە بابەتیانە دووردەکاتـەوە، ئەوەیـە کە شارەزایی کەمە دەربارەی ئاواکاری و چۆنیەتی ئاوەدانی و پێشکەوتن چونکە لەوانەیە ڕووداوێك لە ڕووداوەکان لە خودی خۆیدا تایبەتمەندێتی خـۆی هـەبێت و سروشتێکی جیای دەبێت لە ڕووداوی هەمان بابەت.

٧- لەسـەر مێـژوونووس پێویـستە ئـەم سـەربردانەی وەریـدەگرێت ئـەوا هەڵیبسەنگێنێت بە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ بنەچـەی ڕووداوەکـە یـاخود هاوشـێوەی ئەم جۆرە ڕووداوە، بـە دانـایی شـیکاری بـۆ بکـات و تـەواو خـۆی یەکلابکاتـەوە نەوەکو وەهم و خورافاتی تیادا باسکرابێت وەکو زێدەڕۆیی لە ژمارەی سەربازانی جەنگێك.

٨- لەسەر مێژوونووس پێویـستە شـێوازەکانی ڕەخنـەی بابەتیانـە جێبـەجێ بکات بۆ زانیاریە مێژووییەکان و ڕاستکردنەوەیان، لەبەر ئەوە پێویـستە سـیفاتی ڕەوشــت بــەرزی و ماریفــەی گــشتی هــەبێت بــۆ ئــەوەی بگاتــە ڕێبازێــك لــە لێکۆڵینەوەی مێـژوودا لـە ڕێگەیـەوە هەمیـشە چارەسـەری هەواڵـە مێژووییـەکان بکات، لەبەر ئەوە پێویستە زانیاری گشتی و ڕۆشـنبیری گـشتی هـەبێ، جگـە لـە زانیاری ئەوتۆ لە بارەی ژیانی کۆمەڵگە، جگە لە بـەراوردکردنی ڕابـردوو و دەمـی ئێستا بۆ ئەوەی زیاتر تێی بگەین[٨].

### چوارەم/ تیۆری ئاواکاری لە لێکدانەوەی مێژوودا:

ئـیبن خەلـدون داکـۆکی لـە ئاواکـاری و گرنگـی شارسـتانیەت دەکاتـەوە، وە بەدواداچـوونی بنـەما سـەرەکیە بزوێنـەرەکانی بـە جوڵـەکردنی شارسـتانیەت و پەرەسەندنەکانی ڕووداوە مێژووییەکان، چونکە مێژوو لای ئەو بریتییە لە هۆکارو شیکاری مێژوو نەك تەنها سەربردە، لەبەر ئەوە هـەروەکو خـۆی ئامـاژە دەکـات

تەنها مەبەست ئەوەنیە ڕابردوو دیار بخرێت بەقەدەر ئەوەی سوودو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگیرێت، ئەمەش مانای فەلسەفەی مێژوو دەگەیەنێت.

پاشان جەخت لە بوونی دەسەلات و دەولەت دەکاتەوە بۆ گەشەسەندنی ئاواکاریەکەو کۆمەلگەی مرۆڤایەتی، واتە مەبەستی پێویستی بوونی سیستەم و یاساکانە بۆ بەدواداچوون و ڕێکخستن و پەرەسەندنی ئەم ئاواکاریەو کۆمەلگەی مرۆڤایەتیە[9]، وە زانین و بەدواداچوونی چۆنیەتی دروستبوونی ئاواکاری و هۆکارەکانی سەرهەلدان و گەشەسەندن و ڕووخانی دەبێتە هۆی مایەی زانینی جولەی مێژوو، بەتایبەتی ڕۆلی فاکتەرەکانی جوگرافیایی و ئابووری و مرۆییەکان تیایدا[10].

ئبین خەلدون باس لە پرسی پێکەوەژیانی مرۆڤەکان دەکات لەگەل یەکتر بەو مانایەی وەکو کۆمەلگەیەکی دانەبڕاوی تێکهەلکێشی خاوەن بەرژەوەندی لەگەل یەکتردا، چونکە کۆمەلگەکان ئاواکاری و شارستانیەت دروست دەکەن و پێویستیان بە یەکتر هەیەو نە شارو نە شارستانیەتیش بەبێ کۆمەلگەی مرۆڤایەتی دروست نابێت، دوو هۆکاری سەرەکیش هەن بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤەکان بکەن وەکو کۆمەلگە لەگەل یەکتردا بژین، یەکەمیان: پێویستی مرۆڤ لە خواردن و بژێوی ژیان لە ڕێگەی هاریکاری و دابەشبوونی کار لە نێو تاکەکانی کۆمەلگە. دووەمیان: پێویست بوون بە هەماهەنگی و هاریکاری یەکتر بە مەبەستی بەرگری لە مەترسی و هێرشی دەرەکی[11].

## پێنجەم/ بنەماکانی فەلسەفەی مێژوو لای ئیبن خەلدون:

**ئیبن خەلدون بۆ فەلسەفەکەی جەخت لەسەر دوو بنەمای سەرەکی دەکاتەوە:**

**یەکەم/ گشتگیری:** واتە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی مێژووی گشتی جیهانی بۆ ئەوەی بتوانێ دەرئەنجامێکی گشتیگیرانەش بەرجەستە بکەیت بیگشتێنی بەسەر ڕووداوەکانی مێژوو، واتە دەبێت زانیاریەکی زۆر دەربارەی ئەم جۆرە ڕووداوە مێژووییەی کە لێی دەکۆڵێتەوە کۆبکاتەوە لە زۆربەی دەوڵەت و ناوچە جیاجیاکان جا چ لە سەردەمی کۆن یاخود نوێش بێت، بۆ ئەوەی بگاتە یاسایەکی گشتگیرانە بتوانێت لەسەر هەمان ڕووداوی مێژوویی جێبەجێی بکات، بۆ ئەوەی ئەم مێژوونووسە بیروبۆچونەکانی دووربێت لە هەڵەو ناڕاستەوە، چونکە سروشتی ژیانی مرۆڤایەتی لە یەکتر دەچێت لەگەڵ ئەوەی جیاوازی دەبینرێت لە نێو گەلان لە ڕووی سیستەم و ڕەفتارو بیرکردنەوەیان بەڵام دەتوانین بگەینە دەرئەنجامێکی گشتگیرانە و پێوەری نادیارەکان بکەین لەسەر دیارەکان، واتە مەبەستی ئەو وەکو نموونەی هۆکاری ڕووخانی دەوڵەتی چین ئەو پێی وایە دەبێت مێژوونووس شارەزایی پەیدا بکات دەربارەی ڕووخانی دەوڵەتانی کۆن و نوێ لە مێژوودا و توێژینەوەی ووردی یەکە یەکەی ڕووخانی دەوڵەتەکان بکات، ئینجا دەتوانرێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە بۆچی دەوڵەت دەڕوخێت، واتە دیراسەکردن و خوێندنەوەی چەندین بواری تایبەتی مێژوویی و پاشان وەدەرهێنانی چەند یاساو ڕێسایەکی گشتی بۆ ئەوەی ببێتە وەڵامی ئەو بۆ ئەم جۆرە ڕووداوە مێژووییانە.

**دووەم/ هۆکاری:** واتە فەلسەفەی مێژوو هەوڵ دەدات هۆکاری ڕووداوەکان بە ووردی دیراسە بکات نەك تەنها دیارخستنی خودی ڕووداوەکان، چونکە مەبەستی فەلسەفەی مێژوو بریتییە لە توێژینەوە لەسەر ڕاڤەکردنی هۆکارەکان و

فاکتەرەکانی ڕووداوەکان، لە پرسیارو وەڵامی بەردەوام دەربارەی چەندێتی و چۆنیەتی، بەمەرجێك دەبێت هۆکارێکی گشتگیرانە بێت لە ڕووی کات و شوێنەوە، چونکە گرنگی هۆکاری لەوەدایە کە کۆتی کات و شوێن ببەزێنێت و سروشتێکی گشتگیرانەی پێ ببەخشێت(١٢)، جگە لەمەش دەبێت هۆکاریەکە ڕواڵەتیانەی دەرەکیانە نەبێت بەڵکو دەبێت ئاوێنەیەکی ڕاستەقینەی ناوەڕۆکی ڕووداوە مێژووییەکان بێت، چونکە هەروەك خۆی ئاماژە دەکات و دەڵێت: ((لە ناوەڕۆکەکەیدا ڕامان و لێکۆڵینەوەو هۆکاری بونەوەرەکانە))[١٣].

## شەشەم/ تیۆری دەمارگیری و دەوڵەت:

دروست بوون و ڕووخانی دەوڵەت لای ئیبن خەلدون پەیوەستە بە (دەمارگیریەوە)، کە کردوویەتی بە بنەمایەکی سەرەکی سەرهەڵدان و نەمانی دەوڵەتان، دەوڵەتیش ناوەندێکە ئیبن خەلدون بە دەوریدا دەخولێتەوە و تیۆریاکەی لەسەر جێبەجێ دەکات، ئەم دەمارگیریە سەرەتایەکە بۆ دروستبوونی دەوڵەت و پاراستنی لە هەر مەترسیەکی ناوخۆیی یا دەرەکی، چونکە یەکبونی خوێن بنەمای یەکەمی دەمارگیری هۆزایەتیەو ئەندامانی هۆزێکیش پەیوەستن بەیەکەوە لە ڕووی لایەنگیری کردنی یەکترو بەرگری و پاراستنی گیانی یەکتری، بەردەوام بەزەیین لەبەرامبەر یەکتردا و یارمەتی و پاڵپشتی یەکترن لە بەرامبەر کەسێکی دەرەکی یا نامۆ یا مەترسیدار، جگە لە پەیوەندی نێوان هۆزێك لەگەڵ هۆزێکی تر کە جۆرێك لە هاریکاری و پاڵپشتی یەکتر دەبینرێت بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر لە ئەندامانی یەك هۆز، واتە تەنها یەکەبەستنەوەی خوێن دەمارگیری دروست ناکات بەڵکو بە شێوەیەکی کەمتریش یەکبەستنەوەی ڕەگەزی یا نەتەوەیی جگە لە هاوپەیمانێتی و پێکەوەژیانی ئاشتیانە.

لەنێو کۆمەڵگەی کۆچەرێتی زیاتر یەکبەستنەوە لەسەر بنەمای دەمارگیری بەدی دەکرێت و ئەم پەیوەندیەش وەکو نەریتێکی بۆماوەیی دەمێنێتەوە نەوەکان پەیڕەوی دەکەن و بە پشتگیری کردن لە یەکتر دڵشاد دەبن و سەرکەوتن بەدەست دێنن، لە سروشتی دەمارگیری دوورخستنەوەی زیانە لەسەر کۆمەڵگەو بەرگری کردنە لە یەکتری، بەڵام لە هەمان کاتدا هیوایەکی تریان هەیە ئەویش داواکاریەکانیەتی کە بریتیە لە خاوەنداریێتی کردن یا دەسەڵات، بەڵام داواکاری دەسەڵات ئاسان نییە چونکە دەمارگیریەتی جۆراوجۆر هەیە لەوانە دەمارگیری خۆشەویستی سەرکردە بۆ کورسیەکەی، لەبەر ئەوە پێویستە دەمارگیریەك لە هەمووان بەهێزتر بێت ئەوانی تر بکاتە ژێردەستەی خۆی و سەرجەم دەمارگیریەکانی تریش لەژێر فەرمانی دەمارگیرە بەهێزەکە بێت کە دەسەڵات بۆ خۆی دەسێنێت، بەڵام کە خەڵکی دەمارگیر دەسەڵات وەردەگرن دەیانەوێت کەس دەستکاری دەسەڵات نەکات و بە ئارەزووی خۆیان حوکم بکەن نەك هەر ئەوەندە بەڵکو پاشاو دارودەسەکەیشی دەیانەوێت کەس دەستکاری دەسەڵاتەکەیان نەکات و ڕەخنەگرو بەرهەڵستکار نەبن بۆ هەر کارێك کە دەیکەن.

دەمارگیریەت دوای ئەوەی سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت لە دامەزراندنی دەوڵەت، ئینجا دەوڵەتیش بە چەند قۆناغە تەمەنێکدا تێ دەپەڕێت و کۆتاییەکەیشی گەیشتنە بە لوتکەی هەرەم، لێرەدا دەمارگیریەکی نوێی بەهێز دێتە بوون و لەناوی دەبات و دەوڵەتێکی نوێ لەسەر حیسابی دەوڵەتە ڕووخاوەکە دروست دەبێت، بەم جۆرەش دەوڵەتان سەرهەڵدەدەن و دەڕوخێن، دەوڵەتیش بە گوێرەی بیروڕای ئیبن خەلدون تەمەنی دیاری کراوی خۆی هەیە وەکو مرۆڤ و درێژترین ماوەی تەمەنی دەوڵەتیش سەدو بیست ساڵە.

پاشا کە بە پشتگیری و هۆکاری دەمارگیریەتەوە گەیشتۆتە سەرۆکایەتی بەڵام بۆ حوکمی ڕەهایی خۆی و خۆشی حوکمڕانیەتی بەبێ ئەوەی کەسێ لێی بپرسێتەوە لێرەدا هەوڵدەدات خەڵکی دەمارگیر لە خۆی دووربکاتەوەو لە جیاتی ئەوان خەڵکی مەوالی و دەرەکی و پیشەوەرانی جیاجیاو بێگانە لە خۆی نزیك دەکاتەوە وەکو جێگرەوەی خەڵکی دەمارگیر، ئەمەش مانای ئەوەیە دەمارگیریەت فاکتەری سەرهەڵدانی دەوڵەتە، لە هەمان کاتدا فاکتەری لەناوبردنی دەوڵەتە لەبەر بەرهەڵستکاریان بۆ حاکم یا پاشا[١٤]، کەواتە لێرەدا دوو مەسەلەی دژەوانی لە ڕێڕەوی مێژوودا هەن ئەوانیش:

١- بە دەمارگیریەت سەرکردایەتی دروست دەبێت، وە دەوڵەتان سەرهەڵدەدەن و پاشاکانیش پەیدادەبن.

٢- سەرکردایەتی کردن خۆش نابێت تەنها بە ڕێگەی وازهێنانی پاشا یا سەرۆك لە خەڵکی دەمارگیر و دەمارگیریەت[١٥].

یاخود خەڵکی دەمارگیر پشتیوانن بۆ خاوەن دەوڵەت لە سەرهەڵدانی هەروەها خەڵکی دەمارگیر بەرهەڵستکارو دژی خاوەن دەوڵەتن لە سەرکردایەتیەکەی[١٦].

جگە لەمانەش مەسەلەی خۆشگوزەرانی کە ئیبن خەلدون زۆر باسی دەکات بەو پێیەی کە هێزی دەوڵەت زیاد دەکات چونکە خۆشگوزەرانی مەبەستی شارستانیەت و ئاواکاریە[١٧]، سەرکردەکان شانازی بەوە دەکەن کە وڵاتەکەیان بگاتە پلەی خۆشگوزەرانی، بەڵام خەرجیەکانی زیاتر دەبن و هەژاران هیلاکتر دەبن و خەڵکی خۆشگوزەرانیش دەوڵەمەندتر و ئارەزوومەندانە تر دەژین. جا لێرەدا داهاتی دەوڵەت بەش ناکات و خاوەنی دەوڵەت دەست ددکات بە وەرگرتنی پارەوپوولی زیاتر بە پاساوی جۆراوجۆر لە خەڵکی، ئەمەش دەبێتە

هـۆی لاوازبوونـەوەی ژیانیـان، پـشتیوانی خـەڵکی بـۆ خـاوەن دەوڵـەت کـەمتر دەبێتــەوە، لێــرەدا خــاوەن دەوڵــەت یــا ســەرۆك یــا پاشــا بــۆ پاراســتنی خاوەنداریەتیەکەی دەست دەکات بە زیادکردنی بەخششی سەربازان و بـەکرێ گیراوان بۆ ئەوەی ژیانیان هاوشانی ژیانێکی خۆشگوزەرانی سەردەمەکەی خۆیان بێـت و لەسـەر دڵسۆزیان بـۆ خـۆی ڕایانگرێـت و بیانهێڵێتـەوە. بـەڵام ئـەم خۆشگوزەرانیە هۆکارێکی سەرەکیە بۆ شێواوبوونی دەوڵەت و سەرەتایەکە بـۆ گەنـدەڵی، کەواتـە خۆشـگوزەرانی لوتکـەی هـەرەمی دەوڵەتـە، کەواتـە دوو مەسەلەی دژەوانی نوێ هەیە:

١- خۆشگوزەرانی ڕواڵـەتی شارستانیەتە، لـە هـەمان کاتـدا خۆشـگوزەرانی تێکدەری شارستانیەتە.

٢- خۆشـگوزەرانی مەبەسـتی ئاواکاریـە، لـە هـەمان کاتـدا خۆشـگوزەرانی زەنگی کۆتایی هێنانە بە ئاواکاری[١٨].

هـەروەها ئـەم خۆشـگوزەرانیە وڵاتـی دراوسـێ دەترسـێنێت، جگـە لەمـەش دەبێتە هۆی مایەی چاوتێبڕینی هۆز و خەڵکی کۆچەری دەمارگیری نوێ[١٩].

### حەوتەم/ خولە بەدواداهاتەکانی شارستانیەت:

ئـیبن خەلـدون شـیکاری دروسـتبوونی دەوڵـەت و شارسـتانیەت بـە پێویـست بوونی تاکەکان بۆ پێکەوە ژیان لـە چوارچێوەی کۆمەڵگـەوە لێـك دەداتـەوە بـۆ ئەوەی بتوانن پێداویستی یەکتر بـە یـەکتری پڕبکەنـەوە، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی پەیـدابوونی پیــشەو کــارو ســەرهەڵدانی ڕێکخــەرێك کــە بتوانــێ ژیــان و پەیوەندیەکانیان ڕێك بخات و ماف و چارەنووسیان بپارێزێت، ئەم ڕێکخەرەش لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی سیاسیەوە دەبێت لەژێر دەستی پاشا یـا فـەرمانڕەوا،

واتـە هاتنەکایـەی پاشـا یـا فـەرمانڕەوا پێویـستیەکی تاکـەکانی کۆمەڵگەیـە بـۆ ڕێکخستنیان لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا.

بە گوێرەی تیۆریاکەی ئەو دەوڵەت بە سێ قۆناغی بەدواهات تێدەپەڕێت، لـە کۆچـەرێتی دەسـت پێـدەکات دواتـر مەدەنیـەت و پاشـان داڕمـان، وەکـو بوونەوەرێکی زیندوو لەدایك دەبێت و گەشـە دەکـات پاشـان لەناودەچێت، ئـەم خولە بەدواهاتانەش بەم جۆرەن:

١- **قۆنـاغی کۆچـەرێتی:** واتـە سـەرەتا مـرۆڤ لـەم قۆناغـەدا ژیانیـان ژیـانی کۆچەرێتیە، وەکو هۆزەکـانی بیابـان یـا بەربـەرەکانی ئەوانـەی لـە چـیاکاندا لـە شێوەی کۆمەڵگـەی هۆزایـەتی و بنەماڵـەیی دەژیـن، یـا مەغۆلـەکان ئەوانـەی لـە دەشـتاییەکاندا دەژیـن، ئەمانـە هـەموویان دەمارگیرییـەکی زۆر بـەهێزیان هەیـەو ناچنە ژێـر یاسـای مەدەنیەتـەوە، تـەنها پێداویـستی و پێڕەوەکانیـان حوکمیـان دەکـات، ئەوانـەن کـە لـە قۆنـاغی پـێش قۆنـاغی مەدەنیـەت دەژیـن لـە ژیـانی مرۆڤایەتیدا.

ئەندامانی هۆزە کۆچەریەکان بەرژەوەندیەکانیان کۆیـان دەکاتـەوە، سـەرەتا بەرژەوەندی و پێداویستی هەرەگرنگ پاشا تەواوکاریەکان، ئەوەی کـە حوکمیـان دەکات یەکێتی دەمارگیریانە بەتایبەتی لە پشتگیری کردنی ئەم خزم و کەسانەی خوێن کۆیان دەکاتەوە و هەمیشە و بەردەوام پاڵپـشت و پـشتیوانی یـەکترن، وە هەرچـەند پەیوەنـدی نێـوان تاکـەکانی دەمارگیریـەت بـێ گـەردو ڕیشدارتر بێـت ئەوەنە دەمارگیریان بۆ یەکتر بەهێزتر دەبێت و زیـاتریش دەتـواونن بەسـەر ئـەم هۆزو تیرەو کۆمەڵگە دەمارگیرانە زاڵ بن کە کەمتر پـیرەوو نـەریتی دەمارگیریـان تیـادا زاڵـە بـە تایبـەتی ئەگـەر هـۆزو تـیرەو خـوێنی تـر ئاوێتـەی بـن، هـۆزیش پارێزگـاری لـە دەسـەڵات دەکـات ئەوەنـدەی کـە پارێزگـاری لـە دەمارگیرەکـەی

بکات، وە ئەوەی پاڵپشتە بۆ دەمارگیریەت دوو فاکتەرە، ڕێزگرتنی ئەندامانی هۆز بۆ گەورەکەیان و پێداویستیان بە شێوەیەکی بەردەوام بۆ بەرگری و هێرشکردن.

لەم قۆناغەدا ڕەفتاری کۆچەرێتی و توندوتیژی و درندەییان تیادا بەدی دەکرێت لە ڕووی ژیانیان و کاروچالاکیان، زۆر ئاگاداری نەریت و پێڕەوی خۆیانن و دەیپارێزن و بە ئاسانی دەستبەرداری نەریتەکانیان نابن جگە لەمەش زیاتر ئازاتر و خێرخوازترن لە چاو خەڵکی شارنشین چونکە خەڵکی شارنشین ئارەزووی پشوودان و خۆشی ژیانن زیاتر لە خەڵکی کۆچەر.

جگە لەمەش هەموو هۆزێك تاکەکانی دەمارگیری تایبەتی خۆیان هەیە بۆ یەکتر کە پەیوەندیەکانیان زۆر بە هێز ترە لەم پەیوەندیە دەمارگیریەی نێوان هۆزێك لەگەڵ هۆزێکی تری ناوچەیەك کە دەمارگیریەکی گشتی و لاوازتر کۆیان دەکاتەوە، لەبەر ئەوە سەرکردایەتی و خاوەندارێتی کردن هەمیشە بۆ زیاترین ئەم هۆزانەن کە زیاتر دەمارگیرترن، هەمیشە بەهێزترین دەمارگیر دەتوانێت خەڵکانی دەمارگیری تر لە هۆزەکانی تر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و حوکمیان بکات و سەرکردایەتیان بکات، چونکە کام لە هۆزەکان زیاتر پێڕەوی باوباپیرانیانن هەڵگرتبوو وە دەمارگیرترو بەهێزتر بوون ئەوان زیاتر لە توانایاندا هەیە بەسەر هێزە دەمارگیرەکانی تر زاڵ بن و خۆیان باڵادەست بکەن.

واتە بەم شێوەیە(کۆچەرێتی ← دەمارگیری ← پاڵپشتی یەکتر ← زاڵ بوون و سەرکەوتن).

### ٢- قۆناغی مەدەنیەت(شارستانیەت):

لەم قۆناغەدا دەوڵەت دروست دەبێت و خاوەنداریێتی پاشانشینی سەرهەڵدەدات و کۆمەڵگە لە ژیانی کۆچەرێتی توندڕەوی دەچێتە قۆناغی ئاواکاری شارنشینی جێگیر، ئەمەش لە ئەنجامی زاڵ بوونی هۆزە لە ڕێگەی دەمارگیریەکی بەهێزی پەرەسندو لەسەر حیسابی دەوڵەتێك یاخود وڵاتێك کە لە قۆناغی هەرەمی ژیانیدایە، چونکە ئەم هێزە دەمارگیریە نوێیە نەریتە دەمارگیریەکەی زۆر بەهێزترە لە هێزی دەوڵەتەکە چونکە دەمارگیریەکەی زۆر لاواز بۆتەوەو خۆشگوزەرانی و لاوازی دەمارگیری دەبێتە هۆی لەناوچوونی[٢١].

بەڵام ئەوەی پاڵنەری هۆزە دەمارگیرەکەیە کە دەست بکەن بە داگیرکردن و هێرشکردن بریتیە لە ڕیبازێکی ئاینی یا بانگهێشتێکی سیاسی، چونکە ئەم رەوتە ڕێبازیەی دەیگرنە بەر بە توندی وەریدەگرن و دەیانەوێت بە دەمارگیری بڵاوی بکەنەوە وە بە پێچەوانەشەوە ئەم دەوڵەتەی کە لە قۆناغی هەرەم دایە و هێزو توانای کەم بۆتەوە چونکە باوەڕیان وەکو پێشتر نەماوە و خەڵکەکەی ڕێبازە باوەڕیەکەیان وەکو پێشتر نەماوە تا پشتیوانی لە خاوەن دەوڵەتەکە بکەن بۆ سەرکەوتنی ڕێبازە ئاینیەکەی یا سیاسیەکەی، بەڵکو لە بەرگری کردن دەسڵەمێننەوەو سارد دەبنەوە وەکو پێشتر بەگیانەوە بەرگری ناکەن تەنها ئەوەندە نەبێت کە پارێزگاری لە ژیانیان بکەن، بەڵکو دەوڵەت زیاتر بەرەو لاوازی دەچێت ئەگەر لە چەندین گەلی جۆراوجۆر پێك دێت، هەر لەبەر ئەمەش گرتنی شام و عێراق و فارس و میسر لە لایەن موسڵمانانەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی دوو دەوڵەتی ساسانی و بیزەنتی ساناتر بووە لە گرتنی باکوری ئەفریقا چونکە لەوێ هۆزە بەربەریە دەمارگیرەکان نیشتەجێن، بەڵکو تەنانەت ڕۆمانەکانیش نەیانتوانیوە بەتەواوی کۆنترۆڵیان بکەن لەبەر پاراستنی بەهای دەمارگیریان[٢٢].

سەبارەت بە سەرکەوتنی عەرەب لە گرتنی ناوچەکان ئەوە دەخاتەڕوو کە لەبەر ئەوەی عەرەبی کۆچەر دەمارگیری ئاینیان هەبووە لەبەر ئەوە توانیویانە بالا دەست بن و زاڵ بن بەسەر گەلانی کەمتر دەمارگیر.

هەروەها ئیبن خەلدون سێ بنەما دەست نیشان دەکات بۆ شارنشینی ئەوانیش: جۆری زەوی و مەبەست و سیفاتی حکومەت و زۆری دانیشتوان. پێداویستی هۆزەکە وای لێدەکات جاری یەکەم بەرگری لە خۆی بکات پاشان دەست بە داگیرکاری بکات، دواتر هەوڵی بەردەوام دەدات بۆ ئەوەی باری ژیان و هۆیەکانی ژیانێکی جێگیر و بەردەوام و باشتر مسۆگەر بکات، جا لێرەدا ئیبن خەلدون باس لە ڕۆڵ و کاریگەری فاکتەرە ئابوورییەکان دەکاتەوە لەسەر بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە، ئاماژە بەکارکردنیش دەکات کە بنەچەی بەرهەم هێنانەو بەرهەم هێنانیش بنەچەی شارستانیەتە، هەروەها جەخت لە ڕۆڵی ژینگەی سروشتی دەکاتەوە لە کاریگەری بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، چونکە کۆمەڵگە بەڕادەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەری زەوی و شوێنەکەی و بەپیتی زەویەکە و ئاووهەواو و دەرامەتی سروشتیەکەی، سروشت بزاوی مرۆڤ دیاری دەکات و ڕۆڵی دەبێت لە کارو چالاکی مرۆڤەکان، هەروەها کاریگەری بەسەر سیفاتی جەستەیی و دەروونی و ژیریەکەی دەبێت، بەڵکو ئاستی ڕۆشنبیری بۆ دیاری دەکات، لەبەر ئەوە شارستانیەت سەرهەڵنادات تەنها لە ناوچەی دیاریکراوی شیاو نەبێت.

بەگوێرەی تیۆری ئیبن خەلدون حکومەتێکی بەهێز بنەمایەکی ترە لە بنەماکانی شارستانیەت، مرۆڤی جێگیر پێویستی بە ڕێکخستن و پاراستن هەیە. هەروەها پێویستی بە حکومەتێکی دادپەروەر هەیە هێمنی و دادپەروەری مەبەستی بێت و بتوانێت بەرژەوەندیەکانی مرۆڤەکان بپارێزێت، حکومەتێکی

هاندەر بێت، هۆشداربێت، گرنگی بە لایەنی بازرگانی بدات و هەمیشە هەوڵی نوێکردنەوەی شێوازەکانی بەرهەم هێنان و بژێوی هاونیشتمانیان بدات واتە حکومەت لە خزمەتی قۆناغی شارستانیەت دادەبێت بەم جۆرەش دەوڵەت دەگاتە ڕادەی دەوڵەمەندی.

زۆری ژمارەی دانیشتوان ڕۆڵی خۆی هەیە لە خولقاندنی شارستانیەت چونکە پێکەوەژیانی مرۆڤەکان و هەماهەنگی و دابەشبوونی کارو لە نێوانیاندا دەبێتە هۆی ئەوەی بەرهەمی تواناکانی خۆیان زیاتر بکەن لە پێداویستیەکانیان، کە پێداویستی زیادی کرد ئەمە لە خزمەتی شارستانیەت و خۆشگوزەرانی خۆیانە و پاشان ڕەنگدانەوەی دەبێت لە ڕووی بەهێزی دەوڵەت، خۆشی و ڕابواردنیش ژمارەی دانیشتوان زیاد دەکات، کە ژمارەی دانیشتوانیش زیادی کرد لە سەرەتادا مانای زۆربوونی خەڵکی دەمارگیرە[٢٣]، ئەمەش مانای بەهێزی و پێشکەوتنی دەوڵەت دەگەیەنێت.

هەروەها لە ڕواڵەتەکانی شارستانیەت زۆربوونی مەوالی و خەڵکی دەرەوی وڵات و پیشەوەرانە، ئەمانە لە پێداویستیەکانی خۆشگوزەرانین، خۆشگوزەرانیش لە سەرەتادا هێزی دەوڵەت زیاد دەکات[٢٤].

٣- **قۆناغی کەوتن:** یەکێك لە فاکەرەکانی کەوتنی دەوڵەت دەمارگیریە، هەروەها زۆری خەڵکی دەرەکی و پیشەوەران، لەگەڵ ئەوەی سەرکردە یا پاشا بەهۆی دەمارگیریەوە دەگاتە دەسەلات، بەلام بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی فەرمان و حوکم بکاتو کەس لە گەندەڵی ئەو نەپرسێتەوە دەست دەکات بە دوورخستنەوەی دەمارگیرەکان و پەرتەوازەکردنیان، ئالێرەدا خەڵکە دەمارگیرەکەی خۆی لێی دەبنە دوژمنی، بەتایبەتی کە ئەم پیشەوەرو خەڵك دەرەکیانە تا دێت زیاتر دەبنە جێی متمانەی سەرکردەو پلەوپایەی بەرزیان پێ

دەدرێت لەسەر حیسابی خەڵکە دەمارگیرەکە، ئەمەش زەنگێکە بۆ لاوازی دەوڵەت و پێشی هەموو شتێکیش ئەم پەیوەندیە بەهێز و بەزەییەی کە هەبوو لەمەو پێش لە نێوان سەرکردەو خەڵکە دەماگیرەکە نامێنێت، بەڵکو متمانەش لە نێوانیاندا بوونی نابێت، سەرکردەکە ڕێگەنادات ئەوان ڕەخنەی لێ بگرن و بەدوایاندا دەچێت بەکوشتن و گرتنیان بەم هێزە بەکرێ گیراوانەی بۆ خۆی کۆی کردبۆوە.

هەروەها خزمانی نزیکی سەرکردە بەتایبەتی کوڕانی ئەو دەکەونە خۆشگوزەرانی و ڕابواردنەوە و پەروەردەکردنیان دوور دەبێت لە نەریت و پێڕەوی ڕەسەنایەتی چونکە بە تەنها بیر لە بەرژەوەندی و هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەنەوە، ئەم ڕابواردن و خۆشیە تەنها سەرکردەو نزیکەکانی ناگرێتەوە بەڵکو هەروەك پەندەکە دەڵێت خەڵکی لەسەر ئاینی پاشاکانیانن، واتە ئەم جۆرە ژیانە خەڵکانی دیکەش دەگرێتەوە.

لێرەدا لەبەر خەرجی زۆری دەوڵەت و پڕکردنەوەی پێداویستیە نوێیەکانی ژیانی نوێ کە خۆشگوزەرانی داوای دەکات، باجەکان دەستکاری دەکرێن و لە چەندێتی و جۆرێتییەوە، وەکو باجی کڕین و فرۆشتنی ناو بازاڕەکان ئەمەش گرانی بازاڕی لێ دەکەوێتەوەو خەڵکیش بێزاری خۆی دەردەبڕێت، جا لێرەدا خەڵکی هەست بەوە دەکەن ئەم ماندووبونەو هەوڵانەی دەیدەن بۆ وەدەستهێنانی پارەوپول تەواو جێی خۆی ناگرێتەوە چونکە دەسەڵاتداران دەست دەخەنە کاروباری دارایی ئەوان و باجی جۆراوجۆر دەسێنن لەبەر ئەوە خەڵکی لە ڕووی کارو کاسبیان بۆ پارەوپول بەرەو ساردبوونەوە دەچن[٢٥].

بەشێکی زۆری خەرجی دەوڵەت دەچێتە خزمەتی چینی سەربازانەوە بۆ ئەوەی خاوەنداری دەوڵەت زۆرترین پشتیوانی ئەوان بەدەست بهێنێت و لەکاتی

پێویستیدا به هانای بێن، جگه له خەرجی تری خاوەنداری دەوڵەت، جا لێرەدا ئەو دەست به پاره کۆکردنەوە دەکات لە ڕێگەی پرۆژەی ئابووری جۆراوجۆر لەوانە کڕین و دەست بەسەراگرتنی زەوی و ئاژەڵ و بەشداری کردن لە کاروچالاکی بازرگانی گەوره و ڕکابەری دروستکردن لەگەڵ بازرگانان و خاوەنداری زەوی و ئاژەڵداران بۆ ئەوەی زۆرترین سوودو قازانج بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، جا لێرەدا بازرگانان و خاوەن زەوی و ئاژەڵداران بێزار دەبن و بەشێکیان وڵات جێ دەهێڵن بۆ ئەوەی ئەم پارەو پولەی ماویانە لە دەستی نەدەن، ئەمەش به گشتی تێکچوونی باری ئابووری وڵات دەگەیەنێت، ئاواکاری شێواوی تێدەکەوێت و وڵات بەرەو لاوازی و داڕمان دەبات.

فاکتەرێکی سەرەکی تر داکۆکی لەسەر دەکاتەوە بریتیە له فاکتەری ڕەوشتی دەروونی کە لێرەدا پەیوەستی دەکات بە خۆشگوزەرانیەوە، لە بەسەربردنی ژیانی ئارەزوومەندانەی ڕابواردنەوە، وە دوورکەوتنەوە لە سیفاتی مەردایەتی و جوامێری و بڵاوبوونەوەی خراپەکاری و دوورکەوتنەوە لە دەمارگیریەتی بەزەیی و هاوکاری یەکتری، ئەمانەش هەمووی دەبنە هۆی لاچونی توندوتۆڵی تاکی کۆمەڵگە لە خزمەتکردنی ڕاستەقینەی دەوڵەت چونکه تەنها بیر لە هەوەس و خزمەتی خۆیان دەکەنەوە، ڕابواردنیش ڕەفتار تێك دەدات و کۆمەڵێ سیفاتی گەندەڵی و ناڕێکی دەچێتە نێو دەروونەوە، چونکه لێرەدا دەروون دەکەوێتە نێو ژیانی دونیایی و ماددی، ململانێ و ناکۆکی جێگەی هاریکاری و پشتیوانی دەگرێتەوە، خێرو چاکە زۆر دەگمەن دەبێ و ئینجا ڕۆڵی دەبێت لە لاوازی و تێکچوونی دەوڵەت، ئەم خەڵکانەی کەوتونەتە ژێر کاریگەری ڕابواردنەوە سەردەمی مەردایەتی و دەمارگیری لەیاد دەکەن و وا خۆیان نیشان دەدەن کە زیرەکن و ڕۆشنبیرن و خۆیان بە کەسانی پێشکەوتوو دادەنێن[٢٦]، کەواتە

ڕەسەنایەتی دەمارگیری لە دەوڵەتدا تەمەنی درێژتر دەکات و بە پێچەوانەشەوە لادان لە دەمارگیریەت تەمەنی کورتر دەکات و بەرەو کەوتن دەچێت.

دوایین مەبەستی شارستانیەت لای ئیبن خەلدون ئەوەیە کە لێپرسراوانی دەوڵەت و پاشان خەڵکی گشتی دەکەونە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی، لێرەدا گیانی کارکردن لاوازدەبێت و زیاتر خزمەت بە خودی خۆیان دەکەن ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی دەمارگیریەتی دەوڵەت(٢٧)، دواتریش خاوبوونەوەی پەتی بەیەکبەستنەوەکانی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و دابەزینی ئاستی پەیوەندیە گیانیەکان.

## هەشتەم/ پێگەی تیۆریاکەی:

ئیبن خەلدون هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی مێژوو وەکو زانستێك بخاتەڕوو کە ڕێساو بنەمای خۆی هەیە لە لێکۆڵینەوەو بەدواداچونیدا، ڕووداوەکانی مێژوو وێنایەکی بۆ دەکێشرێت کە بگونجێت لەگەڵ ڕووی ڕاستەقینەی ڕێڕەوەکانی مێژوو و ئاراستەکانی.

ئبن خەلدون لە پێش ئەوروپیەکانەوە کەوتووە دەربارەی بابەتی فەلسەفەی مێژوو، هەرچەندە لە لایەن هەندێ کەسەوە واباسکراوە کە فەسەفەکەی بۆ مێژوو زیاتر پێداگرتن لەسەر مێژووی ئیسلام و زیاتر لەم مێژووەدا جێبەجێ دەکرێت بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە دەمارگیریەت و دەوڵەتەوە، وە ڕۆڵی کۆچەرێتی و ئاواکاری لە تیۆریا فەلسەفەکەیدا، لەبەر ئەوە زیاتر تایبەتە بە مێژووی ئیسلام و عەرەب بەتایبەتی مێژووی ڕۆژئاوای ئیسلام چونکە ئەو زۆربەی ژیانی لەوێ بەسەربردووەو تیۆریاکەی ئاوێنەی مێژوو و ژیانی کۆمەڵگەی ئەم ناوچەیە، ئیبن خەلدون هەروەکو خۆی ئاماژە دەکات ئامانجی لەم

فەلسەفەیەدا ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێت چی ڕوویداوە لە بارودۆخەکانی ژیان لە کاتی ڕابردوو و ئێستادا و دواتریش دوای خۆی بەچی دەگات[٢٨].

تیۆریاکەی ئەو پڕیەتی لە پەندو ئامۆژگاری، وە بە تەنها تیۆریاکەی هزری نەبووە بە پشت بەستن بە لایەنی فیکریەوە بە تەنها بەڵکو سوودی لە مێژووی چەندین دەوڵەت وەرگرتووە، جگە لەمەش خۆی چەق بەستوو نەکردووە بە فاکتەرێکی بزوێنەری مێژوو، وە ستایشی ئەم مێژوونووسانە دەکات کە لە توانایاندا هیە شیکارو لێکدانەوە بۆ نووسینەکانیان بکەن[٢٩]، بەتایبەتی شیکاریەکی گشتگیرانەی هۆکاریانە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی.

## نۆیەم/ سەرنج و تێبینی دەربارەی تیۆریای ئیبن خەلدون:

١- هەندێ لە توێژەران باس لەوە دەکەن ئیبن خەلدون زێدەڕۆیی دەکات لە ڕۆڵی کاریگەری ژینگەی جوگرافی لەسەر شارستانیەت.

٢- هەندێکی تر لە توێژەران پێیان وایە گرنگیەکی زۆری داوەتە ڕۆڵی خوێن و ڕەگەز لە ژیانی گەلان، واتە زێدەڕۆیی لە کاریگەری دەمارگیری هۆزایەتی و خوێن، بەتایبەتی لە دروست بوونی دەوڵەت و ڕووخانی.

٣- هەندێ لە توێژەران جەخت لەوە دەکەن کە ئەو زێدەڕۆیی دەکات لە باسەکەیدا دەربارەی ڕۆڵی سەرکردە یا پاشا لە مێژوودا[٣٠].

٤- ڕەخنەی ئەوەی لێ گیراوە کە جیاوازی نەکردووە لە نێوان زاراوەکاندا وەکو زاراوەی(عەرەب) و (ئەعرابی)، چونکە عەرەب واتە هەموو عەرەبەکان بەڵام ئەعرابی تەنها عەرەبی کۆچەر دەگرێتەوە[٣١].

٥- هەروەها ڕەخنەی ئەوەی لێ گیراوە کە دەڵێت دەوڵەت و شارستانیەت وەکو مرۆڤ تەمەنی هەیە، لەدایك دەبێت و گەشەدەکات و دەمرێت و حەتمیەت بۆ ئەم بیرۆکەی دەدا[٣٢].

٦- ئیبن خەلدون دەڵێت مەبەستی شارستانیەت خۆشگوزەرانی و ڕابواردنە پاشان کەوتن، بەڵام ئەمە جێی ڕەخنەیە چونکە شارستانیەت زانست و زانیاری و شارەزایی و ئەزموونە، ئەمانەش هەمووی پێشکەوتنی لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان دەگەیەنێت.

٧- زۆرترین ڕەخنەی ئەوەی لێ گیراوە کەلە تیۆریاکەیدا زیاتر جەختی لەژیان و مێژووی باکوری ئەفریقا کردووە نەك جیهان بە گشتی، بەڵام دیارە ئەمەش لەم کاتەدا ئاسان نەبووە بە حوکمی سەختی هۆیەکانی هاتووچۆی ئەو کات[٣٣].

**پەراوێزەکان:**

١- د.رأفت الشیخ: تفسیر مسار التاریخ، ص٥٨.

٢- د.جمیل موسى النجار: فلسفة التاریخ مباحث نظریة، ص ص٢٧٥-٢٧٩.

٣- د.سالم حمیش: الخلدونیة في ضوء فلسفة التاریخ، ص١٥١.

٤- د.رأفت الشیخ: تفسیر مسار التاریخ، ص٥٩.

٥- محمد الحسیني الشیرازي: فلسفة التاریخ، ص١٥.

٦- إبن خلدون: المقدمة، ص٧.

٧- د.جمیل موسى النجار: فلسفة التاریخ مباحث نظریة، ص ص٢٧٨-٢٧٩.

٨- ابن خلدون: المقدمة، ص ص٢٣-٥٢.

٩- ابن خلدون: المقدمة، ص ص٤٣ومابعدها.

١٠- د.عبدالمنعم ماجد: العمران نظریة لابن خلدون في تفسیر التاریخ، ص١٤٤.

١١- ابن خلدون: المقدمة، ص٥٠.

١٢- د.أحمد محمود صبحي: فلسفة التاريخ، ص١٣٨.

١٣- ابن خلدون: المقدمة، ص١٢.

١٤- د.جميل موسى النجار: فلسفة التاريخ مباحث نظرية، ص ص٢٩٢-٢٩٣.

١٥- د.رأفت الشيخ: تفسير مسار التاريخ، ص٧١.

١٦- د.أحمد محمود صبحي:فلسفة التاريخ، ص١٤١.

١٧- مجموعة من الباحثين: الموسوعة الفلسفية المختصرة، ص١٥.

١٨- ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٧٩-١٨٠.

١٩- د.أحمد محمود صبحي: فلسفة التاريخ، ص١٤١.

٢٠- ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٣٠-١٣٨.

٢١- د.مفيد كاصد الزيدي: المدخل إلى فلسفة التاريخ، ص ص١٠٨-١٠٩.

٢٢- د.أحمد محمود صبحي: فلسفة التاريخ، ص١٤٤.

٢٣- د.رأفت الشيخ: تفسير مسار التاريخ، ص ص٧٨-٨٠.

٢٤- د.مصطفى النشار: فلسفة التاريخ، ص٦٨.

٢٥- ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٥٠-١٥٨.

٢٦- ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٦٦-١٨٩.

٢٧- ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٧٨-١٧٩.

٢٨- د.جميل موسى النجار: فلسفة التاريخ مباحث نظرية، ص٣٠٥.

٢٩- د.عثمان موافي: ابن خلدون ناقد التاريخ والأدب، ص٢٤.

٣٠- د.هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص ص١٦٠-١٦٤.

٣١- د.أحمد محمود صبحي: فلسفة التاريخ، ص١٥٠.

٣٢- د.عبدالمنعم ماجد: العمران نظرية لابن خلدون، ص١٤٤.

٣٣- د.هاشم يحيى الملاح المفصل في فلسفة التاريخ، ص ص١٦٨-١٧٠.

## سەرچاوەکان:

د.أحمد محمود صبحي:

١- فلسفة التاريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية، (الاسكندرية: ١٩٧٥).

د.جميل موسى النجار:

٢- فلسفة التاريخ مباحث نظرية، ط١، المكتبة العصرية، (بغداد: ٢٠٠٧).

ابن خلدون:

٣- المقدمة، تقديم وتحقيق إيهاب محمد ابراهيم، مكتبة ابن ضيا للطبع والنشر والتوزيع، (القاهرة: ٢٠٠٩).

د.رأفت الشيخ:

٤- تفسير مسار التاريخ(نظريا في فلسفة التاريخ)، عين للدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعية، (القاهرة: ٢٠٠٠).

د.سالم حميش:

٥- الخلدونية في ضوء فلسفة التاريخ، ط١، دار الطليعة للطباعة والنشر، (بيرو: ١٩٩٨).

د.عبدالمنعم ماجد:

٦- العمران نظرية لإبن خلدون في تفسير التاريخ، ضمن كتاب (بحوث في تاريخ الحضارة الاسلامية) مؤسسة شباب الجامعة، (الاسكندرية: ١٩٩٨).

د.عثمان موافي:

٧- ابن خلدون ناقد التاريخ والادب، (الاسكندرية: ١٩٧٦).

مجموعة من الباحثين:

٨- الموسوعة الفلسفية المختصرة، نقلها عن الانجليزية: فؤاد كامل وآخرون منشورات مكتبة النهضة، مطبعة اوفسيت المينا، (بغداد: ١٩٨٣).

محمد الحسيني الشيرازي:

٩- فلسفة التاريخ، ط١، مؤسسة الوعي للطباعة والترجمة والنشر، (بغداد: ٢٠٠٦).

د.مصطى النشار:

١٠- فلسفة التاريخ، ط١، شركة الأمل للطباعة والنشر، (د.م: ٢٠٠٤).

د.مفيد كاصد الزيدي:

١١- المدخل إلى فلسفة التاريخ، دار المناهج،(عمان: ٢٠٠٦).

د.هاشم يحيى الملاح:

١٢- المفصل في فلسفة التاريخ دراسة تحليلية في فلسفة التاريخ التأملية والنقدية، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٧).

# توێژینەوەیەك لەبارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی وەهابیەت لەنیمچە دوورگەی عەرەب

شاكر رضا احمد

## چۆنیەتی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی وەهابی و دامەزرێنەرەكەی

دامەزرێنەری ئەم بزووتنەوەیە بریتیە لە محمدی كوڕی عبدالوهاب[1] كوڕی سلێمان كوڕی علی كوڕی محمد كوڕی احمد كوڕی راشد التمیمی كە لەساڵی ١١١٥ ك / ١٧٠٣ ز لەشاری عەینەی باكووری ریاز بە ٧٠ كم لەدایك بووە[2] ئەوەی پەیوەندی هەبێت بەكۆچی دواییەوە لەسەرچاوە مێژووییەكان رێككەوتی جیاواز دەكەوێتە بەرچاو وەك هەندێك وا باس دەكەن كە لەساڵی ١٧٩٢ ز كۆچی دوایی كردووە[3] یان هەندێكی تر دەڵێن لەساڵی ١٧٧٩ز كۆچی دوایی كردوە[4] وە هەندێكی تر بڕوایان وایە كە لە ساڵی ١٧٨٧ز مردووە[5] رایەكی تر هەیە دەڵێ لەساڵی ١٧٩١ز مردووە[6] شێخ محمد لەهۆزی تەمیمە كە یەكێكە لەهۆزەكانی عەرەبی و باوكی یەكێك بووە لەپیاوە ئاینیەكان لەنەجد و حیجاز و (قازی) بووە لەعەینە و زۆر قوتابی پێگەیاندووە لەسەر مەزهەبی حەنبەلی[7] ، شێخ محمد خۆشەویستی هەبووە بۆ زانست و هەر لەمنداڵیەوە تواناكان و بەهرەی زیرەكی لێ بەدیار كەوتووە و قورئانی لەبەر كردووە و فقە و تەفسیر و حەدیسی خوێندووە و قوتابی كتێبەكانی ابن تیمیە بووە لە فقە و بیرورا و پێی سەرسام

بووە بۆ خوێندن و وەرگرتنی زانست چۆتە مەککە ، مەدینە ، بەسرا ، ئەحسا ، عێراق و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ نەجد[8] .

سلێمانی برای شێخ محمد دەڵێت ((باوکم زۆر سەرسام بووە بەزیرەکی محمدی برام ، باوکم لێی فێربووە و سوودی زۆری لێوەرگرتووە ، هەموو کات باوکم دەیگووت سوودی زۆرم لە محمد وەرگرتووە))[9] .

ئەو کاتانەی کە شێخ محمد لە گەشتەکانیدا بوو نەخۆشی تاعون لە عەینە بلاو بۆوە و ئەمیری شارەکە بەم نەخۆشیە مرد میری نوێ لەگەڵ عبدالوهابی باوکی محمد رێکنەدەکەوتن بۆیە لەکاری دادوەری لایدا و ئەویش کۆچی کرد بۆ (حریملاء) کە یەکێکە لەشارەکانی نەجد دوای گەیشتنی ئەم هەواڵە بە محمد گەشتەکەی دەپچڕێنێ و دەگەڕێتەوە بۆ (حریملاء) بەنهێنی بە رێگای (ئەحسا) لەساڵی ١٧٣٨ ز لەگەڵ باوکی وانە بە قوتابیان دەڵێتەوە[10] لەماوەی ژیانیشیدا (٢٠) ژنی هێناوە و (١٨) کوڕی هەبووە[11] .

## بیروباوەڕی وەهابی

ئەوکاتەی کە شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب دەگەڕێتەوە بۆ حریملاو لەووڵاتی نەجد دەست دەکات بەبڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی لەئەنجامدانی چاکە و دوورکەوتنەوە لەخراپە و خەریك بووە بەکاری زانست و زانیاری و بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی بێگەرد و خۆپاراستن لەشرك و شێوە و جۆرەکانی[12] لەسەرەتادا ئەم بانگەوازە بانگەوازێکی چاکسازی بوو بەنسبەت ئایینی ئیسلام و داواکردن بوو بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانی ئیسلامی سەرەتایی لە زهد و سادەیی ، ئەوە چەسپاوە کە بانگەوازی وەهابی سوورە لەسەر پەیڕەو کردنێکی تەواو بەقورئان و کەلتوری ئیسلام وەك چۆن هاتووە[13] ، چونکە شێخ دەیبینی خەڵکی لەگۆڕی

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەپارێنەوە و نکوڵی لەوە کرد و بەکوفری زانی ، شێخ بڕوای تەواوی بەوە هەبوو کە پرەنسیپی پاڕانەوە و شەفاعەتی گۆڕ لەگەڵ بڕوای یەکبوونی ئیسلامدا یەکناگرێتەوە ، ئەو مەزارانەی کە موسڵمانان ڕاهاتبوون لەسەر پیرۆزکردنیان و زیارەتکردنیان بەو بتانەی دادەنان کە جاهیلەکان لەجیاتی خودا دەیانپەرست ، خەڵکی داوایان لەو بەخاك سپێردراوانەی ناو ئەو مەزارانە دەکرد لای خوا شەفاعەتیان بۆ بکەن و لێی نزیك ببنەوە ئەمەیش بەلای شێخەوە وەکو ئەوە وابوو کە جاهیلەکان بەرامبەر بە بتەکان دەیانکرد[١٤] .

ئەم بیرۆکەیە مێشکی شێخی گرتبووەوە تەنانەت وایلێهات لەژیاندا تەنیا یەك مەبەستی هەبوو ئەویش گێڕانەوەی خەڵکی بوو بۆ خۆرسکییە سەرەتاییەکانی ئیسلام کە ئەویش خواپەرستی و وازهێنان لەپەرستنی گۆڕ و مەزارەکان بوو دیارە ئەو یەکەمین کەس نەبوو بیری لەوە کردبێتەوە پێش ئەویش ابن تیمیە بەر لە پێنج سەدە هەمان بیری هەبوو[١٥] بانگەوازی محمد بن عبدالوهاب لەسەر سێ کۆڵەگە وەستا بوو کە ئەمانەن :-

١- یەکتاپەرستی : کە داوای یەك خوایی دەکرد و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنرێ و پشت ببەسترێ بە قورئان و بەحەدیس و اثر السلف .

٢- بانگەواز بۆ جیهادێکی مەشروع لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئەم فکرەیە .

٣- ئیجتیهاد : بەمەرجێك پێچەوانەی قورئان وفەرمودە و اثار السلف نەبێت[١٦] .

لەم چوارچێوەیەشدا شێخ محمد بن عبدالوهاب هەڵسا بەدانانی کتێبێك بەناوی (التوحید) لەگەڵ هەندێ دانراوی تری سەرەتای شۆڕشە چاکسازیە ئاینیەکەی بوو[١٧] .

## سەرەتای بلاوبوونەوەی بزووتنەوەکە لەحیجاز و دەوروبەری

سەرەتاکانی بزووتنەوەی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ بزووتنەوەی وەهابیەکان و لەراستیدا ئەوان بە دەست پێشخەری بزووتنەوەی ئۆتۆنۆمی دژ بە تورکەکان دادەنرێن[18] ، دوای ئەوەی محمد بن عبدالوهاب بینی کە بزووتنەوەکەی پشتگیریەکی ئەوتۆی لێناکرێ لەشارەکەی خۆی بۆیە کۆچی کرد بۆ (الدرعیە) و پشتگیری بانگەوازەکەی کرا لەلایەن محمد بن سعود و بەڵێنی پاراستنی و سەرکەوتنی شێخی دا ئەم دوو بنەماڵەیە ژن و ژنخوازیان کەوتە نێوان ، لەو کاتەوە بنەماڵەی سعود کاریگەریان زیاتر بوو لەنەجد و دورگەی عەرەبی و بەشێکی زۆریان کردە یەك پارچە تا ئێستاش ئەندامانی بنەماڵەی محمد بن عبدالوهاب بە ئالی شێخ دەناسرێن و پلەی دادوەری شەرعیان بەدەستە لەگەڵ وەزارەتی داد کە لووتکەی دەسەلاتن لە فتواداان لە ولاتی سعودیا[19] پشتگیری کردنی دەسەلاتدارانی درعیە لە بانگەوازەکەی شێخ هەلی زیاتری رەخساند بۆ بلاوبوونەوەی بەپلەیەکی گەورە ، ئەم بانگەوازە بنچینەی دەوڵەتی سعودیەی یەکەم بوو لەبەر ئەوەی سروشتیە ئەگەر شێخ محمد بن عبدالوهاب رۆڵێکی کاریگەر ببینێ لەئاراستە کردنی دەوڵەتە نوێیەکەی و بەڕێوەبردنی[20] .

محمد بن سعود شێخی درعیە یەکەم سەرکردەی ئەوکاتە بوو کە رێنماییەکانی وەهابیەکانی قبوڵ کرد و هەوڵیدا لەگەڵ حوکمی خۆی بیگونجێنێ لەشارەکەیدا وە لەژێر چاودێری خۆی محمد بن عبدالوهاب لەماوەکانی کۆتایی ژیانی خۆیدا ژیا لەگەڵ ئەنجامدانی چالاکیەکانی[21] لەساڵی ١٧٦٥ ز میری درعیە کە شاروچکەیەکی بچووکی سەرەتاییە ژمارەی ماڵەکانی لە ٣٠ماڵ تێنایەڕێت ، محمد بن سعود لەعەشیرەتی عنزە کە بلاوبوونەوە بە تەواوی جەزیرەدا کە باپیری لەناوەڕاستەکانی سەدەی پازدەم هاتوتە ئەو ناوچەیە و تیایدا جێگیر

بووە و لەو کاتەوە حوکمی درعیە لەژێر دەسەلآتی ئەوان دابووە وە لەململانێی بەردەوام دابوونە لەگەڵ بنی خالد دەسەلآتدارانی (الاحساء) کە چەندین هەڵمەتیان هێناوەتە سەر ئەم ناوچەیە ئەمەش هۆکارێکی سەرەکیە بۆ هاتنی محمد بن عبدالوهاب بۆ ئەم ناوچەیە چونکە بنی خالد رۆڵی کاریگەریان بینی لەدەرکردنی شێخ لە شاری عەینە ئەم بارودۆخە یارمەتیدەر بوو بۆ دروست بوونی هاوپەیمانیەتیەك لەنێوان شێخ محمد بن عبدالوهاب و شێخی درعیە لەدژی دوژمنەکەیان[٢٢] ، هەروەك چۆن ئەم بزووتنەوەیە لایەنگر و پشتگیری بۆ پەیدا بوو بەهەمان شێوەش دژی پەیدا بوو کە بەتوندڕەوی تاوانبار کرا ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە زۆربەی لایەنگرانی بزووتنەوەکە لەخەڵکی (بەدو) بوون کە بە خراپی لەرێنمایی و ئامۆژگاریەکان گەیشتبوون بەوەی هەر کەسێك لەگەڵیان نەبێت ئەوا کافرە و کوشتنی واجبە هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هێرشیان کردە سەر شوێنە پیرۆزەکان لە عێراق لەساڵی ١٨٠١ز دواتریش بەئاراستە شام رۆیشتن و هەرەشەیان لە دیمەشق و حەلەب کرد[٢٣] .

شێخ یارمەتی شێخ محمد بن سعودیدا بۆ ئامادەکردنی جەنگاوەر و چەك بۆ دەرچوون بەمەبەستی کۆکردنەوەی مجاهد لەدرعیە بۆ دەرەوەی سنوورەکەی بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی و جێگیرکردنی روکنەکانی لەجەزیرە و دەرەوەیدا وە شێخ خۆی سەرپەرشتی ئامادەکردنی پیاوەکانی دەکرد و هێزی ئامادە دەکرد وە لەسەر وانە وتنەوەکانیشی بەردەوام بوو ، بۆ چەند ساڵێك شەڕ بەردەوام بوو لەنێوان لایەنگرانی بانگەوازەکە و دژەکانی و سەرکەوتنیش بەشی خاوەن بانگەوازەکە بوو لەزۆربەی کاتەکاندا گوند دوای گوند دەکەوێت و دەکەوتە ژێر دەسەلآتی شێخ وە لەساڵی ١١٧٨ك / ١٧٧٣ز شاری (ریاض) ئازاد کرا بەسەرکردایەتی میرعبدالعزیز بن محمد بن سعود وە

حاكمی شارەكە دهام بن دواس لادرا كە كەسایەتیەكی زاڵم بووە وە پەیمانەكەی هەڵوەشاندبووەوە لەگەڵ بانگەوازخوازانی بزووتنەوەكە بەئازادكردنی (ریاض) سنووری خاك فراوان بوو بۆ بانگەوازەكە وە ژمارەیەكی زۆرتر لەخەڵك هاتنە ژێر باری بزووتنەوەكە بەرەزامەندی خۆیان[٢٤] پەیوەندی نێوان بنەماڵەی سعود و وەهاب بەهێزتر بوو كاتێك عبدالعزیز بن محمد ١٧٦٥ – ١٨٠٣ هەڵسا بەداخوازیكردنی كچی شێخ محمد بن عبدالوهاب وە سەركردایەتی هێزەكانیشیدا بە كورەكەی بەناوی سعود وە سەركەوتنی گەورەی بەدەست هێنا كەدوای گرتنی ریاض شێخ دحام بن دویش روویكردە حەسا و توانی دەستی بەسەر دابگرێت ، هیچ روداوێكی تر لەم سەردەمەدا روونەدا لەهەرێمی نەجد تا كوژرانی عبدالعزیز لە درعیە لەساڵی ١٨٠٣ ز كە لەكاتی نوێژی عیشا لەمزگەوت كوژرا بەدەستی كەسێكی ئێرانی[٢٥] كە دواتر هەر لەوێ كوژراوە[٢٦] .

دوای مردنی شێخ محمد بن عبدالوهاب بزووتنەوەكە لەسەر رێگای خۆی رۆیشت و نەوەستا وە بنەماڵەی ال سعود سەرپەرشتیان كرد و بەهێز بەرێوەیان برد و بەئاراستەی حیجاز جوولان[٢٧] لەساڵی ١٧٩٢ز و ١٧٩٣ز كرداری دوژمنایەتی دەستی پێكرد لەنێوان میری وەهابیەكان و غالبی شەریفی مەككە كە بیرو باوەرە سیاسی و ئایینیەكانی نەدەگونجا لەگەڵ وەهابیەكان چەند جارێك هەڵمەتیان هێنا بوو بۆ سەر یەكتر[٢٨] ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا لەساڵی ١٨٠٣ز وەهابیەكان توانیان دەست بگرن بەسەر مەككە بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەك لەلایەن شەریف غالب كە هەڵات بۆ جددە و دوای دوو ساڵی تر وەهابیەكان توانیان دەست بگرن بەسەر مدینە المنورە[٢٩] .

دوای ئەمە هەرچی زێر و كەلوپەلی گرانبەها بوو لەحوجرەی پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) تالانیان كرد و كارەكە زیاتر مەترسیدارتر بوو بەوەی كە درعیە

فەرمانیدا بەسەر شەریف غالب کە هاتنـە ژوورەوەی کـاروانی حاجیـەکانی مـصر وشام و عیراق قەدەغە بکات ، ئەم قەدەغە کردنەش گـەورەترین تـەحـەددی بـوو بەرامبـەر بـە سـوڵتانی عوسمـانی[٣٠] دەسـت بەسـەراگرتنی مەککـەش لەلایـەن وەهابیەکانەوە بووە هۆە تورە بوونی دەوڵەتی عوسمـانی و بـەخێرایی داوای لـە والیە نزیکەکانی ناوچەکە کرد و فەرمانی پێدان بەجولان و رێ وشوێنی پێویـست وەك لەبەشێك لەنامە نووسراوەکاندا بۆ ابراهیم پاشا والی حەلـەب لەسـەرەتاکانی ١٢١٨ك / ١٨٠٣ز دەنووسێ دوای باسکردنی ئەوەی کە روویداوە هەواڵی دەداتـێ کە (سعودی دەرچوو) گـەمارۆی مەدینـەی منـەوەرەی داوە داوایکـرد بـە نـاردنی یارمەتی و هێزی سەربازی لەشام و مـصر بـۆ رزگـارکردنی[٣١] سـەرەتا دەوڵـەتی عوسمانی داوایکـرد لـە والی بەغـدا کـە نـزیکترین والی بـوو لەنەجـد وە ئـەم والیـە خــەریکی کێــشە ناوەخۆییــەکانی بــوو و هێزەکەشــی لاواز بــوو توانـــای بەرەنگاربوونـەوەی سـعودیەکانی نـەبوو بۆیـە چـەند جارێـك سـەرکەوتوو نـەبوو لەبەرپەرچـدانەوەی هەڵمــەتی وەهابیــەکان لەســەر ســنووری عێـراق ئـەمجارە عوسمانیەکان روویانکردە والی شام ئەویش سەرکەوتووتر نەبوو لەوالی بەغدا بۆیە دەوڵـەتی عوسمـانی بێئومێـد بـوو لەوالیـەکانی لەبەغـدا و لەشـام ئینجـا رووی وەرگێرا بۆ مصر وداوایکرد لەوالیەکـەی (محمـد علـی) لەسـاڵی ١٨٠٧ کـە هێـرش بکاتــە ســەر وولاتــی عــەرەب بــۆ گێڕانــەوەی (الحـرمین الـشریفین) لەدەسـتی سعودیەکان بـەلام محمـد علـی نـەیتوانی داواکـەی دەوڵـەتی عوسمـانی جێبـەجێ بکـات تـەنها لـە سـاڵی ١٨١١ز نـەبێت دوای کۆتـایی هێنـان بـە ڕەگـی داکوتـاوی مەمالیك لەمصر لەقەسابخانەی قەلا[٣٢] .

## دەست بەسەرداگرتنی یەمەن

دوای ئەوەی کە دەوڵەتی سعودی توانی حجاز بخاتە ژێر دەستی خۆی ئەمجارە بەئاراستەی یەمەن هەنگاوینا بۆئەوەی بیخاتە سەر موڵکەکانی تری تاوەکو هیچ هێزێك لەجەزیرە نەمێنێت تەنها هێزی سعودیەکان نەبێت ، بۆ ئەم مەبەستەش سعودیەکان سودیان لەئاڵۆزی بارودۆخی سیاسی یەمەن وەرگرت وە هەروەها لاوازی زەیدیەکان بەهۆی ململانێ لەسەر دەسەلات لەنێوان زەیدیەکان و شێخەکانی هۆزە یەمەنیەکان کە بووبووە هۆکاری لێکهەڵوەشانەوەی یەکێتی وولات ، هەروەها هەبوونی ناکۆکی لەنێوان نەوەکانی ئیمامی عەلی خۆیان لەسەر جێنشینی لەبەر ئەوەی سعودیەکان هەستیان بەوە کرد کە کۆمەڵێك لەسەرۆك و شێخەکانی هەرێمی (عەسیر) کە دەکەوێتە نێوان حیجاز و یەمەن هەستی لایەنگریان هەیە بۆ پرەنسیپەکانی وەهابیەت وە یارمەتی سعودیەکانیاندا لە فتح کردنی حیجاز وە یەکێك لە سەرکردەکانی عەسیر بەڵێنیدا بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی وەهابی لەناوچەی عەسیر لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی وەهابی فراوان بوو لەبڵاوبوونەوە بەئاراستەی باشوور بۆ ناو خاکی یەمەن[٣٣] و توانیان لەساڵی ١٨٠٤ دەست بگرن بەسەر ناوچەی (ابو عریش) لەووڵاتی (تهامە) و دواتر هەڵمەتیان برد بۆ هەردوو بەندەری (لحیە و حدیدە) لەوکاتە ئیمامی یەمەن هەستی بە مەترسی هاتنی سعودیەکان کرد و داوای یارمەتی کرد لەسوڵتانی عوسمانی و والی مصر لەدژی سعودیەکان تا محمد علی بەرەنگاری سعودیەکان بۆوە و توانی لە ١٨١٣ حیجاز بگرێت دواتر عەسیر و ئینجا یەمەن کە لە ١٨١٩ گەڕاندیەوە بۆ ئیمامی یەمەن[٣٤] .

## دەسەڵاتی وەهابیەکان بەسەر عمان و قەتەر و بەحرەین

لەساڵی ۱۸۰۰ هێزێکی وەهابیەکان دوای ئەوەی کە دەستیان گرت بەسەر حسا و قطیف سەرکردەی هەڵمەتەکە بڕیاریدا کە هەڵمەتەکەی درێژە پێبدات بۆیە بە ئاسانی توانی کۆنترۆڵی هەموو عمانی ڕۆژئاوا بکات و سەرکەوتوو بوو لەسەرنج ڕاکێشانی هۆزە بەدوەکانی ناوچەکە بەمجۆرە لەناوەڕاستی ساڵی ۱۸۰۲ هەموو کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی نیمچە دوورگەی عەرەبی لەدوبەی تا بەسرا کەوتە ژێر کۆنترۆڵی وەهابیەکان[٣٥] لەسەردەمی حوکمی سعود بن عبدالعزیز ۱۸۰۳ – ۱۸۱۵ ز وەهابیەکان ناوچەی (البریمی) باکووری ڕۆژئاوای (مسقط)یان گرت و بنکەیەکی جێگیریان لێ دانا بۆ ئەوەی لەوێوە هەڵمەتەکانیان ئەنجام بدەن وە ڕازی بوون بەوەی کە زەعیم و سەرۆکەکانی پێشوو لە شوێنی خۆیان بمێننەوە مادام دەبنە لایەنگری وەهابیەکان بەوەی کە کاروباری ناوەخۆیان بەڕێوە ببەن و زەکات بدەن لەگەڵ دانی بەشێك لەدەستکەوتەکانی جەنگ[٣٦] .

لەساڵی ۱۸۰۹ز وەهابیەکان بەیارمەتی (رحمە بن جابر) توانیان قەتەر بەتەواوی بخەنە ژێر دەستی خۆیان وە بەحرەینیش زۆر بەخێرایی خۆیدا بەدەست هێزێکی گەورەی وەهابی کە لەلای (زبارة و قطیف) بۆی هاتن وە لەساڵی ۱۸۱۰ز حکومەتێکی وەهابی پێکهات لە (قطیف و قطر و بحرین) وە مەڵبەندەکەشی بحرین بوو بەسەرکردایەتی (عبدالله بن عفیصان) و لەژێر فەرمانڕەوایەتی وەهابیەکان[٣٧] .

بەمجۆرە دەسەلاتی وەهابیەکان زۆربەی ناوچەکانی دورگەی عەرەبی گرتەوە ، لەبەرامبەردا بەریتانیا هەستی بە مەترسی ئەم دەسەلاتە کرد لەسەر بەرژەوەندیەکانی لەبەر ئەوەی دەسەلاتی دەوڵەتی سعودیای یەکەم گەیشتە کەنداوی عەرەبی و دەریای سوور و باشووری عێراق کە کاریگەری هەبوو لەسەر

ڕێگای ووشکایی نێوان ئەوروپا و ڕۆژهەلات ، لەسەرووی ئەمانەوە ئەو بنچینە ئایینیەی کە ئەم دەوڵەتە پشتی پێ دەبەست بووە هۆی ڕێگرتن لە بەستنی ڕێککەوتننامە لەگەڵ بەریتانیەکان هەروەها بووە هۆی دژایەتی کردنی هەبوونی دەسەلاتی بێگانە لەناوچەکە بۆیە لەساڵی ١٨٠٦ ز لێدانیکی کوشندە لە کەشتیگەلی ئینگلیزی درا و بەمجۆرە ئاوەکانی کەنداو کەوتە ژێر کۆنترۆلی وەهابی ، دەوڵەت لەسەردەمی حوکمی سعود بن عبدالعزیز فراوان بوو لەلایەنی سیاسیەوە گەیشتە کەربەلا لەعێراق و حوران لەوولاتی شام و هەموو دوورگەی عەرەبی کەوتە ژێر دەسەلاتیان[٣٨] .

## ئەنجام

دوا بەدوای گەڕان و لێکۆڵینەوەمان لەم بابەتە دەگەینە چەند ئەنجامێك وەکو دەبینین کە وەهابیەکان سەرەتا وەکو بزووتنەوەیەکی چاکسازی ئایینی میانڕەو دەستیان بە کارەکانیان کرد بەلام تیایدا سەرکەوتوو نەبوون چونکە هێزێك و پالپشتیەکی ئەوتۆیان نەبوو تا بتوانن بیروباوەڕەکەیان پێی بەهێز بکەن و بیکەنە هۆکارێك بۆ چەسپاندنی ویستەکانیان بگرە دژایەتیش کران و لەم پێناوەدا ئەشکەنجەشیان بینی ، بەلام دواتر دەبینین کە لەگەڵ بنەماڵەی (ال سعود) یەکدەگرن ئەوکات دەبنە خاوەن بیروباوەڕێکی پتەو لەهەمان کاتدا خاوەن هێزێکی سەربازی پتەو لەناوچەکە کە توانیان زۆربەی ناوچەکانی حیجاز و ئەحسا و تا دەگاتە ئەو ئاستەی تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەبی بکەوێتە دەستیان و یەکیبخەن .

بزووتنەوەی وەهابی لەبەر ئەوەی توانی بچێتە ناخی مرۆڤەکانەوە چونکە داواکەی لەراستی هەلقولابوو بۆیە سەرەڕای دژایەتی عوسمانیەکان و محمد علی

و هەندێك جاریش پلانی بەریتانیەکان لەدژیان کەچی لەناو نەچوون چونکە رەگیان داکوتابوو لەدڵی ناوچەکان وتوانیبووی بچێتە دڵی هەموو مرۆڤێکەوە ، بەلاَم تێبینی دەکەین لەماوەکانی دواتر بەتایبەتی دوای نەمانی شێخ محمد عبدالوهاب و لەلایەن ئەو دەشتەکیانەی کە لە جەوهەری بزووتنەوەکە نەگەیشتبوون ئەم بزووتنەوەیە رێگایەکی تری گرت ئەویش بریتی بوو لە تالاَنی وکوشت وبڕین بەتایبەتی ئەوەی کە لەکەربەلا کرا ، هەروەها بوونە هۆکاری رێگرتن لەکاروانی حاجیان بۆ چوونە حەج ، بۆیە ئەم هەڵوێستە وایکرد کە ئەم بزوتنەوەیە لەپێش چاو ناشیرین بێت و تائاستێك جەماوەریەتی روو لەکەم بوونەوە بێت و دژایەتیەکی زیاتر بکرێت لەلایەن ناحەزەکانیانەوە .

بەلاَم بەهەموو شێوەیەك ئەم بزووتنەوەیە بە یەکەم بزووتنەوەی چاکسازیی ئایینی عەرەبی دادەنرێت کە بووە دەرگایەکی کراوە بۆ سەرهەڵدانی چەندین بزووتنەوەی تری هاوشێوە لەنیشتمانی عەرەبی .

## پەراوێزەکان

١) د. جميل بيضون و اخرون ، تاريخ العرب الحديث ، ط١ ، دار الامل ، ١٩٩٢ ، ص ، ١٤٧ .

٢) د. على محمد الصلابي ، الدولة العثمانية عوامل النهوض و اسباب السقوط ، بيروت ، ٢٠٠٨ ، ص ص ٣٦١–٣٦٢ .

٣) أ د.زكريا قورشون،العثمانيون و ال السعود في الارشيف العثماني١٧٤٥–١٩١٤م،ط١، بيروت،٢٠٠٥، ص٣٣ .

٤) د. جميل بيضون و اخرون ، م .س ، ص ١٤٧ .

٥) ج .ج لوريمر ، دليل الخليج ، ت: مكتب الترجمة بديوان حاكم القطر ، ط٣ ، ص ١٥٧٣ .

٦) عبدالمنعم الهاشمي ، ترجمة الامام محمد بن عبدالوهاب ، ئینتەرنێت .

٧) أ د . زكريا قورشون ، م . س ، ص ٣٣ .

٨) د. على محمد الصلابي ، م . س ، ص ٣٦٢ .

٩) عبدالمنعم الهاشمي ، م . س .

١٠) أ د. زكريا قورشون ، م . س ، ص ٣٤ .

١١) ج . ج لوريمر ، م . س ، ص ١٥٧٣ .

١٢) د. على محمد الصلابي ، م . س ، ص ٣٦٢ .

١٣) ج . ج لوريمر ، م . س ، ص ١٥٧٣ .

١٤) د. علی وەردی ، چەردەیەکی کۆمەڵایەتیانە لە مێژووی نوێی عێراق ، و: دلێر میرزا ، ب ١ ، چ تیشك ، ل ل ٢٥٨ – ٢٥٩ .

١٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥٩ .

١٦) د. جميل بيضون و اخرون ، م .س ، ص ١٤٧ .

١٧) عبدالمنعم الهاشمي ، م . س .

١٨) د. ئەلبێرت عیسا ، ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم ، سلێمانی ، ٢٠٠٨ ، ل ٣٧ .

١٩) د. جميل بيضون و اخرون ، م .س ، ص ١٤٨ .

٢٠) المصدر نفسه ، ص ١٤٨ .

٢١) ج . ج لوريمر ، م . س ، ص ١٥٧٥ .

٢٢) أ د . زكريا قورشون ، م . س ، ص ٤٣ .

٢٣) د. جميل بيضون و اخرون ، م .س ، ص ١٤٩ .

٢٤) د. علی محمد الصلابي ، م . س . ص ٣٦٣ .

٢٥) کورانسیز لەکتێبەکەیدا (تاریخ الوهابیین) دەڵێ ئەم بکوژە خەنجەری بەکارهێناوە و دەروێشێکی کورد بووە کە هاتبووە ریزی سوپای میر عبدالعزیز بەمەبەستی کوشتنی لەبەر ئەوەی وەهابیەکان سێ کوڕیان سەربڕیبوو لە قەسابخانەی کەربەلا لە ساڵی ١٨٠١ ز (بڕوانە ج . ج لوریمر ، دلیل الخلیج ، ل ١٥٧٧) .

٢٦) ج . ج لوریمر ، م . س ، ص ١٥٧٧ .

٢٧) د. علی محمد الصلابي ، م . س ، ص ٣٦٣ .

٢٨) ج . ج لوریمر ، م . س ، ص ١٥٧٧ .

٢٩) د. علی محمد الصلابي ، م . س ، ص ٣٦٣ .

٣٠) د. احمد طربین ، تاریخ المشرق العربي المعاصر ، دمشق ، ١٩٩٣ ، ص ١١٥ .

٣١) ا د . زکریا قورشون ، م . س ، ص ٧٥ .

٣٢) د. علی محمد الصلابي ، م . س ، ص ٣٦٥ .

٣٣) د. احمد طربین ، م . س ، ص ١١٥ .

٣٤) م . ن ؛ ص ١١٦ .

٣٥) ج . ج لوریمر ، م . س ، ج٢ ، ص ص ٩٧٢ — ٩٧٣ .

٣٦) د. احمد طربین ، م . س ، ص ١٢٥ .

٣٧) ج . ج لوریمر ، م . س ، ج٣ ، ص ١٢٠٢ .

٣٨) د. علی محمد الصلابي ، م . س ، ص ص ٣٦٣ — ٣٦٤ .

## سەرچاوەکان

١- د. احمد طربين ، تاريخ المشرق العربي المعاصر ، دمشق ، ١٩٩٣ .

٢- د. ئەلبێرت عیسا ، ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم ، سلێمانی ، ٢٠٠٨ .

٣- ج .ج لوريمر ، دليل الخليج ، ت: مكتب الترجمة بديوان حاكم القطر ، ط٣ ، ج٢ و ج٣ .

٤- د. جميل بيضون و اخرون ، تاريخ العرب الحديث ، ط١ ، دار الامل ، ١٩٩٢ .

٥- أ د.زكريا قورشون ، العثمانيون و ال السعود في الارشيف العثماني١٧٤٥-١٩١٤م ، ط١ ، بيروت ،٢٠٠٥ .

٦- عبدالمنعم الهاشمي ، ترجمة الامام محمد بن عبدالوهاب ، ئینتەرنێت .

٧- د. علی وەردی ، چەردەیەکی کۆمەڵایەتیانە لە مێژووی نوێی عێراق ، و: دلێر میرزا ، ب ١ ، چ تیشك.

٨- د. علی محمد الصلابي ، الدولة العثمانية عوامل النهوض و اسباب السقوط ، بيروت ، ٢٠٠٨ .

# ژیان و بەرهەمەکانی مستەفا نەریمان ( ١٩٢٥ – ١٩٩٤ )

زیاد نەعمان مەحمود

پێشەکی

دەڤەری گەرمیان بە بارتەقای مێژووی پڕ لە چەرمەسەری و مەینەتیەکانی ئاوڕ لە نووسینەوەی مێژوو و دیرۆکەکەی نەدراوەتەوە، مستەفا نەریمان وەکو خاوەن قەڵەمێکی بەبڕشت و پڕ لە داهێنان هەوڵێکی زۆر و بێوچانی دا بۆ ئەوەی کەلێن و کەلەبەرەکانی بواری نوسینەوەی مێژووی و رۆشنبیری گەرمیان و کوردستان پڕ بکاتەوە، بەرێکەوت لە ژیاندا مامۆستایی کردە پیشە و لە هەست و رۆحدا کوردایەتیەکی خاوێن و بێگەرد و لە رۆشنبیریدا قەڵەمی بۆ هەموو بوارێك تاودەدا .

ژیانی تەژی بوو لە خەبات و کۆشش کردن و تاکو دوا هەناسە قەڵەمی لە دەست نەکەوتە خوارەوە و بەردەوام خزمەتی بەکاروانی رۆشنبیری و پەروەردەیی کوردی کردووە ، جێگای شیاو و رۆڵی ئەکتیڤی لە رووپەڕی رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوو ، هاوکات لە رووی کۆمەڵایەتیەوە کەسێکی گونجاو و چالاکی ئەو بوارە بوو .

ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتمەندە بە چەردەیەك لە ژیان و بەرهەمەکانی سەید مستەفای کوڕی سەید ئەحمەد کە بە (مستەفا نەریمان) ناسرا بوو ، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکیەك و سێ بەش و هەربەشێك چەند باسێك لەخۆدەگرێت کە بەم شێوەیە: بەشی یەکەم ژیانی مستەفا نەریمان و بواری پەروەردەیی

(مامۆستایەتی) کە باسەکانی ژیانی و خوێندنی و بواری پەروەردەیی (مامۆستایەتی) لەخۆ دەگرێت ، هەروەها بەشی دووەم کە ڕۆڵی سیاسی مستەفا نەریمان دەخاتە بەرباس ڕۆڵی لە پارتی هیوادا و ڕۆڵی لەپارتی دیموکراتی کورد- کوردستان لە خۆ دەگرێت بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە ڕۆڵی مستەفا نەریمان لەبواری ڕووناکبیریدا شەن و کەو دەکات، تەوەری یەکەم یانەی سەرکەوتنی کوردان هەروەها تەوەری دووەم بەرهەم و دانراوەکانی دەخاتە بەرباس لە( ١- بواری بیبلۆگرافیا Bibliography٢- بواری ئەدەبی و ڕۆشنبیری گشتی ٣- بواری مێژوویی) تەوەری سێ یەم تەرخانکراوە بۆ دانان و وەرگێڕانی کتێبی قوتابخانەکان ، تەوەری چوارەم باس لە بواری ڕۆژنامەوانی دەکات لە کۆتایشدا دەرئەنجام و لیستی کتێبە چاپ کراوەکانی مستەفا نەریمان و پەراوێز و سەرچاوەکان دەخاتەتە روو .

هیوادارەم بەم لێکۆڵینەوەیە خزمەتیکی کەم و بچووکەم بە مێژووی ژیانی ئەو زاتە و لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد کردبێت ، بێگومانم کە بەدەر نییە لە هەڵە و کەموکوڕی .

## بەشی یەکەم/ ژیانی مستەفا نەریمان و بواری پەروەردەیی ( مامۆستایەتی )

### تەوەری یەکەم/ ژیانی وخوێندنی

مستەفا نەریمان ناوی تەواوی (مستەفا کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی شێخ عەبدولصەمدی کوڕی شێخ مستەفای سەید مەحمودە) لە٢٨حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ لەشارۆچکەی (کفری)*لەدایك بووە[1]، ناسراوبە(نەریمان) باوکی بەڕەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی پیرخدری شاهۆ کەلەساڵی ١٣٣٩ز هاتوونتە کوردستان لەناوچەی گەرمیان چەند گوندێکیان ئاوەدان کردۆتەوە،

باوکی ( سەید ئەحمەد ) لە ساڵی ١٨٨٩ لە دایک بووە سەرەتا لای مەلا خوێندویەتی دواتر گەیشتووەتە پلەی روشدییە، لە ساڵی ١٩١٨ لە کفری نیشتەجێ بووە و دوکانێکی قوماش فرۆشی دادەنێت دەست دەکاتە بازرگانی، لە ساڵی ١٩٢١ ژیانی هاوسەری پێکدە هێنیت و(٤) کور و(٢) کچی دەبێت بەناوەکانی ( مستەفا ١٩٢٥، هاشم ١٩٣٥، موکەڕەم ١٩٤٢، فاتیح ١٩٤٤، زەینەب، ئامینە)باوکی پێش نوێژی دەکرد لە کفری لە ساڵی ١٩٨٥ کۆچی دوای کردووە [٢]، نەریمان لە منداڵیەوە دەستی کردووە بە خوێندن سەرەتا لای مەلا خوێندویەتی وە قورئانی خەتم کردووە [٣]، دواتر لە ساڵی ١٩٣١ دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی کفری کەتەنها قوتابیەکان کوڕبوونە [٤]، چەند کەسایەتییەک هاو پۆلی بوونە لە وانە( حوسێن حاجی سەمین، محەمەد قادر، موکەڕەم تالەبانی* ) زۆربەی مامۆستاکانی تورکمان بوونە لەکەرکوکەوە دەهاتن، خوێندنیان تورکمانی بوو کەتەنها کوڕبوون دواترلە ساڵی ١٩٣٣ قوتابخانەیەکی سەرەتای بۆ کچانیش دەکرێتەوە،دوای تێک شکانی شۆڕشی شێخ ئەحمەدی بارزان دوورخستنەوەی کۆمەڵێك لە بارزانیەکان بۆکفری وەلەلایەن باوکی نەریمانەوە داوەت دەکرێن وەك وەفایەك بۆبارزانیەکان هەڵوێستیان بەرامبەر بەشۆڕش [٥]، دوای کۆچی دوایی مەلیك فەیسەل (١٩٢١-١٩٣٣) مامۆستای عەرەب بۆ قوتابخانەی کفری هاتووە، نەریمان لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧ لەتاقیکردنەوەی پۆلی شەشەم دەرچوو چووە قۆناغی ناوەندی کەلەشاری کەرکوك بووە .

خوێندنی ناوەندی لەکەرکووك : لەسیەکانی سەدەی ڕابردوودا قوتابخانەی ناوەندی ودواناوەندی لەکەرکوك بووە ئەو شارانەی سەر بەلیوای کەرکوك بوونە دەچوونە کەرکوك بۆ تەواوکردنی خوێندن کە بەسێ ساڵ دەردەچوون،

لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێی پێکەوە دەیانخوێند، لەڕێگەی باوکیەوە (مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی)ناسیووە کەهانی داوە بۆخوێندنەوەی بلاوکراوەکانی ئەوسەردەمە، دەستی کردووە بەخوێندنی کتێب وگۆڤارەکوردییەکان بەتایبەتی ڕۆژنامەی(ژین)*وکۆمەڵێك ڕۆژنامەی تر، لەساڵی ١٩٤١ توانی قۆناغی ناوەندی لەکەرکوك تەواو بکات[٦].

خانەی مامۆستایانی بەغدا (دار المعلمین)*:دوای تەواوکردنی قۆناغی ناوەندی لەساڵی ١٩٤١ لەخانەی مامۆستایانی بەغدا وەرگیرا [٧]، هاوسەردەمی بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری بووە بەهۆی بلاوکردنەوەی کۆمەڵێك گۆڤارو ڕۆژنامە توانی ببێتە خوێنەری ئەوبلاوکراوانە، وەکۆمەڵێك کەسایەتی گرنگی ناسی لەشاری بەغدا لەوانە (حوسێن حوزنی موکریانی، عەلائەددین سەجادی) دەچووە(یانەی سەرکەوتنی کوردان) لەبەغدا کەڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری وشارستانی بوو لەوسەردەمەدا، دەستی کرد بەنووسین یەکەم نووسینیشی شیعرێك بوو لەگۆڤاری ((گەلاوێژ))بلاّبوتەوە[٨]، هەرلەڕێگەی نووسین و خوێندنەوە تێکەڵ بەسیاسەت بوو پەیوەندی کرد بەحیزبی هیوا لەساڵی ١٩٤٢ [٩]، توانی چەند کەسایەتیەکی سیاسی وڕۆشنبیر بناسێت لەوانە(برایم حەمەخانی گێژ*)و(جەمیل بەگی مەجید پاشای بابان) کەئەندام پەرلەمان بوو لەبەغدا، لەساڵی ١٩٤٤ خانەی مامۆستایانی تەواو کرد، بووە بەمامۆستا لەکوردستان و ناوەراستی عێراق[١٠].

(نەریمان) دوای ئەوەی بینی هەموو میللەتان ڕۆژ ژمێرو ساڵنامەی خۆیان هەیە لەساڵی ١٩٥٧ یەکەم ڕۆژ ژمێری دیواری کوردی دانا کەهەموو ڕووداوە گرنگەکانی کوردستانی تۆمار کردووە، وێنەی دوو سواری کوردی لەسەر چاپ کرابوو[١١]حکومەتیش کەوتە قەدەغەکردن ولەناوبردنی ئەوڕۆژمێرە بەبیانوی

ئەوەی وێنەی (مەلا مستەفای بارزانی) لەسەرە و هەروەها لەسەر ئەو ساڵنامەیە دەستگیر کرا لەلایەن پارێزگاری کەرکوکەوە دوای چەند ڕۆژێك بەکەفالەت ئازاد دەکرێت [١٢]، لەمامۆستایەتی فەسڵ کرا نەریمانیش چووەلای (سەعید قەزاز ١٩٠٤- ١٩٥٩) لەبەغدا کورد بوو وە وەزیری ناوخۆش بوو ئەویش دەیگەڕێنێتەوە بۆ مامۆستایەتی پێی دەڵێت : دەبێت مۆڵەتی چاپ کردن وەربگرێت دواتر چەندین ڕۆژمێری دیوار وگیرفان دەردەکات، لەساڵی ١٩٥٩ دەبێتە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی عێراق بەشداربوو لە زۆربەی چالاکیەکانی لەوسەردەمەدا.

لەگەڵ بەرپابوونی شۆرشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٩ لە ٢٦ تەمووز لەگەڵ حەوت مامۆستای کورد یاداشتێکیان پێشکەش بە ئەنجومەنی شۆڕش بۆخوێندنی کوردی لە٢٧ ی تەمووز لەگەڵ شاندێکی کوردی دەچێتە لای عەبدول کەریم قاسم بۆ پیرۆز بایی کردنی شۆڕش[١٣]، نەریمان بەردەوام جەختی دەکردووە لەسەری ئەوەی کەخوێندن بەکوردی بێت لەکوردستان، بەشداربوو لەهەردوو کۆنگرەی مامۆستایانی کورد کەلەساڵی ١٩٥٩و١٩٦٠ لەشەقلاوە بەستراوە چەند پێشنیارێکی بۆکۆنگرە خستووەتە روو، کەسێکی کۆمەڵایەتی بووە پەیوەندیەکی باشی لەگەل شێخ مەحموودا هەبووە توانیویەتی شێخ وجافەکانی هەڵەبجە پێك بهێنێتەوە دوای تیکچوونی پەیوەندیان[١٤].

دواتر زیاترتێکەڵ بەسیاسەت دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی دوور بخرێتەوە بۆشاری کوت لەناوەڕاستی عێراق لەوێ بەردەوام دەبێت لەمامۆستایەتی لەساڵی ١٩٦٧ دەچێتە بەغدا بەیەکجاری نیشتەجی دەبێت، دەست دەکات بەنووسین وخوێندنەوە کاتێك کۆری زانیاری کورد لەبەغدا دادەمەزرێت دەبێتە ئەندامی ئەم دەزگایە بەشدار بووە لەچالاکیەکانی.

لەساڵی ١٩٧١دەبێتە سەرپەرەشتیاری پەروەردەیی لەبەغدا(مفتش عام) یەكەمین كورد بوو ئەو كارە وەربگرێت تا خانەنشین بوونی لەساڵی ١٩٨٢دەست دەكاتە نووسین وبلاوكردنەوەی كتێب[١٥].

لەساڵی ١٩٧٩وەكو ئەركێكی ئایینی حەج دەكات وەچووەتە لەندەن و پاریس بۆچارەسەری خێزانەكەی، لەساڵی ١٩٤٩ لەگەڵ (خەدیجەی كچی مەلا راغبی مەلا اسماعیل) ژیانی هاوسەری پێكهێناوە نەریمان (٤) كوڕ و(٢)كچی بووە لەبەغدا نیشتەجی بوونە، دوای ساڵانیكی زۆرخزمەت بەپەروەردەو ڕۆژنامەگەری توانی ٢٤ كتێب بەچاپ بگەیەنێت، لەڕۆژی هەینی لە١٩٩٤/٥/٢٧ لەبەغدا كۆچی دوای كردووە[١٦]، وەسیەتی كردبوو لەگۆڕستانی كفری بەتەنیشت باوكیەوە بەخاك بسپێدرێت وەتەلقینی بەكوردی بۆبخوێنن بەلام وەسیەتەكانی نەهاتەدی چونكە لەوكاتەدا بارودۆخی كوردستان سەقامگیر نەبوو نەتوانراوە تەرمەكەی بهێننەوە بۆكفری لەگۆرستانی (محمد سكران)لەڕێگەی بەغدا بەخاك سپێدراوە[١٧]، وەسیەتێكی تری ئەوەبوو كەهەمووكتێبەكانی پێشكەش بەكتێبخانەی كفری بكرێت [١٨]بەلام دوای پێنج ساڵ لەساڵی ١٩٩٩ تونرا بەڕێگەی قاچاغ نزیكەی ٢٩٠٠كتێب وگۆڤار بهێننەوە بۆ كفری وپێشكەش بەكتێبخانەی كفری بكرێت[١٩]. ئێستا ئەو كتێبانە لە بەشێكی كتێبخانەی گشتی كفریدا هەیە .

## تەوەری دووەم/ بواری پەروەردەیی ( مامۆستایەتی )

نەریمان لەساڵی ١٩٤٤خانەی مامۆستایانی بەغدای تەواو كردووە لە ١٩٤٤/١٠/١٨ بڕیاری دامەزراندنی درا بە مامۆستایەتی لەشارەكان بەلام لەسەر داوای(رفیق حیلمی)* و بەرژەوەندی حیزبی هیوا لەناوچەی كەلار* بووە

بەمامۆستا لەگوندەکانی جاف توانی ٥٠ قوتابی بهێنێتە بەر خوێندن بۆماوەی (٢)ساڵ وانەی دەوتەوە لەم ناوچەیە[٢٠]، دواتر لەناحیەی(سەرقەڵا)ی سەربەقەزای کفری دەستی کردبەوانەوتنەوە [٢١]،وەهەوڵێکی زۆریدا بچێتە دەرەوەی وڵات بۆتەواو کردنی خوێندن بەڵام رەفیق حیلمی رازی نەبووە چونکە جێگەی متمانەی ئەو بوو لەهیوادا.

لەساڵی ١٩٤٧ لەقوتابخانەی (کوڵەجۆ) وانەی دەوتەوە لەناوچەی (زەند ئاباد)ی نێوان کەلار وجەلەولا، قوتابخانەکەیانی فراوان کرد ومنداڵێکی زیاتری هێنایە بەر خوێندن، لەکاتی سەردانی پشکێنەری کەرکوک بۆقوتابخانەکەیان نەریمان داوای لێ کرد کەبیگوازێتەوە بۆکەرکوک ئەویش بەڵێنی داکەدەیگوازێتەوە دوای ساڵێك گواستیەوە بۆ کەرکوک لەساڵی(١٩٤٨-١٩٤٩)لەقوتابخانەی(هاشمیە) دەستی کرد بەوانە بێژی لەگەرەکی ئاوچی توانی لەشاری کەرکوک چەند کەسایەتیەکی سیاسی و رۆشنبیری بناسێت لەوانە(جەمال نەبەز، هەژار موکریانی)پەیوەندیەکی باشی هەبوولەگەڵیاندا، لەکەرکوک لەچەندین قوتابخانەی تروانەی دەوتەوە لەساڵی ١٩٥٨دەبێتە بەرێوەبەری قوتابخانەی نەجاح تا ١٩٦١، پاش شۆرشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لەچەند خولێك بەشدار بووە بۆ فێرکردنی منداڵان و ناساندنی ئەلفوبێ ی کوردی بەرێنووسی کوردی، بەردەوام لەهەوڵدا بووە بۆفێرکردنی خەڵکی تەنانەت کاتێك لەزیندان بوو لەجەلەولا بەندکراوانی فێری خوێندن ونووسین کردووە لەساڵی ١٩٦١.دوای ئازاد کردنی بەفەرمانێك دوور دەخرێتەوە بۆشاری کوت لەساڵی ١٩٦١ لەقوتابخانەیەکی ئێوارانی شاری کوت دەستی کرد بەوانە وتنەوە، دواتر لەپەیمانگای(دار المعلمین)ی بەغدا داوای لێ کرا وانەی کوردی بڵێتەوە بەهۆی نەبوونی مامۆستای تایبەت بۆماوەیەك وانەی کوردی دەوتەوە.

ساڵی ١٩٦٦ شاری کوت بەجێدەهێڵێت دەچێتە بەغدا بەهۆی هەڵوێستی سیاسییەوە بۆماوەی ساڵ ونیوێك فەسل کرا،پاش ئەوە داوای لێ کرا لەقوتابخانەی(بارودیە)دەست بکات بەوانە بێژی لەساڵی ١٩٦٧تاساڵی ١٩٧٠دەبێتەبەڕیوەبەری قوتابخانەکە[٢٢]، بەهۆی زۆری خزمەتی لەبواری پەروەردەو دڵسۆزی لەکارەکەیدا لەساڵی١٩٧١ دەکرێتە(مفتش تربوی) پشکنێری پەروەردەیی لەبەغدا لەکەرتی رەسافە، بەشدار بووە لەهەڵبژاردنی کۆمەڵێك مامۆستای کورد لەپەروەردە بۆ وتنەوەی وانەی کوردی لەبەشە کوردییەکان، لەساڵ ١٩٨٢لەسەر داوای خۆی خانەنشین دەبێت دەست دەکاتە نووسین وخوێندن کەبە یەکجاری وازی هێنا لەکاری مامۆستایەتی.

## بەشی دووەم/رۆڵی سیاسی مستەفا نەریمان

### تەوەری یەکەم: رۆڵی لە پارتی هیوادا

لەنێوان ساڵانی ١٩٣٦و١٩٣٧ کۆمەڵێك رووداو سەرنجی سیاسەتوانان ورۆشنبیران و قوتابیانی راکێشا کەهەندێکی نێودەوڵەتی بوون وەکو ئەو گرژی وئاڵۆزییەی لەنێوان وڵاتە رۆژئاوایەکان پەیدابوو،هەروەها هاتنی کۆمەڵێك سەرکردەی نوێ لەئەوروپا کەگیانێکی تۆڵە سەندنەوەیان هەبوو، هەروەها سەرهەڵدانی دیاردەی خۆپرچەککردن ودەست خستنە ناو کاروباری وڵاتانی رۆژهەلات لەلایەن وڵاتە ئەوروپیەکانەوە، داگیرکردنی حەبەشە لەلایەن ئیتالیاوە، لەو ساڵانەش گرانی وقات وقڕیەکی زۆربالی کێشابوو بەسەرجیهاندا، بلاوبوونەوەی چەندین بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیا وەکو(نازی،فاشی،شوعیەت)کەرەنگدانەوەی هەبووەبەسەر جیهاندا، لەناوخۆی عێراقیش بەکرصدقی کەکوردبوو بەکودەتایەك هاتەسەر دەستەلات وکرانەوەیەك

بەرووی دەرەوە هاتەئاراوە، لەم بارودۆخەدا پارتێکی کوردی لەکوردستان دامەزرا، پارتی هیوا دەگەرێتەوە سەرکۆمەڵەیەکی نهێنی بەناوی (دارکەر) کەلەساڵی ١٩٣٧لەکەرکوک لەلایەن کۆمەڵێك لەقوتابیان وڕۆشنبیرانی کورد دامەزرا بەسەرۆکایەتی (یونس رەئوف*)[٢٣]، ناوی دارکەر دەگەرێتەوە بۆناوی کۆمەڵەیەکی ئیتالی کە بۆ یەکخستنی ئیتالیا هەولێدەدا کۆمەڵەی (کاربۆناری واتا خەڵوزفرۆشان)، زۆربەی ئەندامەکانی پێکهاتبوو لەقوتابیانی ناوەندی کەرکوك[٢٤]، ئەم کۆمەڵەیە بەرنامەیەکی نووسراوی تایبەتی هەبوو بۆکوردستانیکی ئازاد وئازادی میللەتی کورد تێدەکۆشا، بەهۆی ئەوەی قوتابیان لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە هاتبوون بۆیە ئەم کۆمەڵەیە لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان پەل وپۆی هاویشتبوو، هەندێکی تردامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە دەگەرێننەوە بۆشاری هەولێر دواتر لەرێگەی ئەوقوتابیانەی چوونەتەکەرکوك لەوێش لقی دامەزراندوە[٢٥]، بەلاّم موکەرەم تاڵەبانی لەدامەزرینەرانی دارکەرو پارتی هیوایە دەڵێت لەکەرکوك دامەزراوە وەخۆی بەشدار بووە لەکۆنگرەی یەکەمی (دارکەر) لەحوزەیرانی ١٩٣٨ لەباخچەی (أم الربعین) لە کەرکوك بریاردرا کەوا ناوی کۆمەڵەکە بگۆرن بۆ(هیوا) هاوشێوەی کۆمەڵەی(هێڤی) وە رەفیق حلمیی کرا بەسەرۆکی بالاّ[٢٦] ئەم پارتە کەوتە چالاکی نواندن لەسەرجەم کوردستاندا پەیوەندی هەبووە لەگەڵ کوردستانی رۆژهەلاّت لەساڵی ١٩٤٢ دوو ئەفسەر میر حاج ئەحمەد و مستەفا خۆشناو چوونەتە (مەهاباد)بۆ پەیوەندی وهاوکاری لەگەڵ سەرکردەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی رۆژهەلاّتی کوردستان بۆئەوەی خەباتیان یەکبخەن[٢٧]، بنکەی پارتی هیوا گوێزرایەوە بۆ شاری بەغدا دەستی کرد بەچالاکی نواندن لەنێو قوتابیان و رۆشنبیران، نەریمان لەساڵی ١٩٤٢ لەخانەی مامۆستایانی بەغدا بوو

چووتە ڕیزی پارتی هیواوە دەستی کردووە بەچالاکی نواندن جێگای متمانەی ڕەفیق حیلمی بووە، لەکفری چەندین کەسی هێناوەتە ڕیزی هیواوە ئابوونەوەی لێ وەرگرتوون، پارتی هیوا ڕێکخستنی لەکفری هەبوو سەرەتا موکەڕەم تالەبانی سەرپەرەشتی ڕێکخستنی کردووە دواتر مەحەمەد قەرەداغی ئەو ئەرکەی پێ سپێدراوە[٢٨].

ناوچەی گەرمیان مەڵبەندی هیوابوو زۆربەی ئەندامەکانی لەم ناوچەیە بوون، نەریمان لەساڵی ١٩٤٤ لەلایەن ڕەفیق حلمی وە دەکرێتە سەرپەرەشتیاری هیوا لە ناوچەی کەلار سوێندی خوارد بەقورئان و نەخشەی کوردستان کە دڵسۆزی حیزب بێت لەڕێکخستنی پەیوەندیەکان بووە لەنێوان (کەرکوک،کفری،خانەقین) [٢٩] پارتی هیوا بەیاننامەیەکی بلاّو کردەوە بەناوی (شیلان)بەزمانی کوردی لەکفری، لەساڵی ١٩٤٣ ناکۆکی کەوتە نێوان ئەندامانی بۆ دوو ئاراستە دابەش بوون ئەمەش بەهۆی سەرهەڵدانی بیروباوەڕی شۆسیالیستی بوو لەنێو هەندی لەئەندامەکانی، دوای بەستنی کۆنفراسی حیزب لەکەرکوك بووە هۆی جیابوونەوەی باڵی چەپەکان لەحیزب[٣٠]، هۆکاری ئەم ناکۆکیەش بۆئەوە دەگەڕایەوە کەئایا گەلی کورد لەخەباتی ڕزگاریدا کام ڕێبازی سیاسی بگرێتە بەرپشت بەڕۆژئاوا یا سۆڤیەت ببەستێت، ئایا کامیان پشتگیری کورد دەکەن و هەروەها ئایا پێویستە پارتی هیوا بەشداری شۆرشی بارزان بکات ویارمەتی وجلەوی سەرکردایەتی بگریتە دەست یان بێ لایەن بێت[٣١]، دوای تێکچوونی پەیوەندی نێوان بارزانی وحکومەتی عێراق بارودۆخ خراپ بوو،پارتی هیوا لەساڵی ١٩٤٣ لەسلێمانی بەئامادەبوونی سەرۆکی بالاّ کۆبونەوەیەکی کردبۆتاوتوێ کردنی بارودۆخی کوردستان و یارمەتی شۆرش مستەفا نەریمان وەکو لێپسراوی کفری ئامادە بوو، زۆربەی ئەو سەرۆك هۆزانەی لەهیوادا ببوون

ئامادەییان دەربڕی بۆیارمەتی دانی شۆرشی بارزان كردنەوەی بەرەیەكی جەنگی دژی حكومەت دەقی ئەم كۆبونەوەیە ڕەوانەی مەلامستەفا كرا، بەلاّم بارزانی باوەڕی بەو بەڵێنانە نەبوو داوای كرد كەسوێندی بۆ بخۆن نەریمانیش چوو بۆ ناوچەی كەلاروخانەقین سوێندی دان سوێندنامەكەی دایە رەفیق حلمیی كە بیداتە بارزانی[٣٢]، لەكاتی بەرپابوونی شۆرش ئەو سەرۆك هۆزانە بەڵێنەكەیان نەبردە سەر وملكەچی هیوا نەبوون، هیوا تووشی كۆمەڵێك كیشە هاتبوو پلان هەبوو بۆ روخانی هیوا، لەساڵی ١٩٤٤ كۆنفرانسێك لەكەركوك بەسترا بۆچارەسەری كێشەكان[٣٣]، ئەم ناكۆكیانە بەردەوام بوو تابەستنی كۆبونەوەیەك لەشاری كەلار لەساڵی ١٩٤٤ نەریمانیش بەنهێنی بەیاوەری هەردوو ئەفسەر(مەحمود تەها و مەجید عەلی) كەكێشەیان لەگەل رەفیق حلمیی هەبوو بەئامادەی كۆمەڵێك ئەندامی تر، دەستیان كرد بەگفتوگۆ بۆچارەسەری كێشەكان بەدەست پێشخەری كەریم بەگی جاف كێشەی نێوانیان چارەسەر كرا بەیاوەری نەریمان گەڕانەوە بۆ كفری[٣٤]، نەریمان لەكاتی گەڕانەوەیدا لەناحیەی سەرقەلاّ دەستگیر كرا بەتۆمەتی ئەوەی كەوا ڕوسی بردووە بۆشاری كەلار بۆماوەی سێ ڕۆژ دەست بەسەر دەبێت لەبنكەی پۆلیسی سەرقەلاّ پاشان بەكەفالەتی باوكی ئازاد دەكرێت گەڕایەوە بۆكفری[٣٥]، پاش ئەوە كۆبونەوەیەك لە ئاوایی(گێژەكان) دەبەسترێت لەكەلار لەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٤٤ بەسەرپەرەشتی مەلا سەید حەكیم (١٨٩٢–١٩٥٧)كەبەكۆبونەوەی (قەنیلە) ناسراوە بۆ كردنەوەی بەرەیەكی شەر بۆ كەم كردنەوەی فشار لەسەر شۆرشی بارزانی ئامادەبووان بەڵێنی یارمەتی دانی شۆرشیاندا[٣٦]، دوای واز هێنانی رەفیق حلیمی لەسەركردایەتی پارتی هیوا لەساڵی ١٩٤٥ پارتی هیوا بووە چەند بەرەیەك ئەندامەكانی پەرت وبلاّو بوونەوە هەندێكیان چوونە ڕیزی بەرەی

(رزگاری کورد)* ئەم پارتە بەرنامەیەکی سیاسی تایبەتی هەبوو کەوتە چالاکی نواندن لەهەموو کوردستاندا نزیکەی ٤–٥ هەزار ئەندامی هەبووە هەڵگری دروشمی(کورد، کوردستان، برایەتی)بووە نەریمانیش چووەتە ڕیزی ئەم پارتەوە بەرپرس بوو لەبردنی نامەکان و بڵاوکراوەکانی ڕزگاری تا هەڵوەشانەوەی لەساڵی١٩٤٦.

## تەوەری دووەم / ڕۆڵی لە پارتی دیموکراتی کورد- کوردستان

لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩–١٩٤٥) زۆربەی وڵاتان گۆرانکاری گەورەیان بەسەردا هات، دامەزراندنی چەند ڕێکخراوێکی جیهانی وەك(نەتەوە یەکگرتوەکان) دامەزراندنی چەندین پارت ودەوڵەتی نوێ لەناوچوونی چەند دەوڵەتێك، چەندین میللەت لەژێر دەستی ڕزگاریان بوو،زۆربەی میللەتان داوای مافی چارەی خۆنووسیان دەکرد،عێراقیش بەدوور نەبوو لەو گۆڕانکاریانە وەکو ڕاپەڕینی ڕەشید عالی گەیلانی وسەرنەکەوتنی، هەروەها سەرنەکەتنی شۆرشی بارزان(١٩٤٣–١٩٤٥) کۆمەڵێك ڕووداوی تر،کوردستانیش بەدوور نەبوو لەو ڕووداوانە، لەمەهاباد لەکوردستانی ڕۆژهەلأت لە١٦گەلاویژی ١٩٤٢ ڕێکخراوێکی سیاسی لەلایەن چەند کەسێکەوە دامەزرا بەناوی (کۆمەلەی ژیانەوەی کورد) بەیەکەم ڕێکخراوی سیاسی ڕۆژهەلأت دادەنرێت کەتوانی جەماوەرێکی زۆر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، پەیوەندیان لەگەل کوردەکانی باشووریش هەبووە لەڕێگەی (برایم ئەحمەد) کەبەرپرسی لقی کۆمەلەی (ژ–ك) بووە لەسلێمانی، ئەم کۆمەڵەیە لەبەرەو پێشچووندا بوو لە١٦ی گەلاوێژی ١٩٤٥ لەمەهاباد کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵەکە بەسترا کەبڕیاردرا ناوی کۆمەڵەکە بگۆڕن بۆ(پارتی دیموکراتی کوردستان) بووە پارتێکی سیاسی خاوەن بەرنامە(٣٧)، ئەم

گۆرانکاریانـە بـووە هـەوێنی گەڵاڵـە بـوونی دامەزرانـدنی حیزبێکـی شۆڕشـگێری لەکوردستانی عێراق لە شوباتی ١٩٤٥، لەحوزەیرانی سـاڵی ١٩٤٦ لـەماڵی (بـرایم ئەحمەد) لەسلێمانی کۆبوونەوەیەك کرا مستەفا نەریمانیش وەکو نوێنەری کفـری ئامـادە بـوو لەسەرچـۆنیەتی دامەزرانـدنی پارتێـك لەکوردسـتانی عێـراق دانـانی ناوەکەی[٣٨]، لە١٦ئابی ١٩٤٦ لەبەغدا بەئامادە بوونی کۆمـەڵێك سیاسـەتمەدار و ڕۆشنبیر بەسەرکردایەتی برایم ئەحمەد کۆنگرەی یەکەمی پارتی بەسترا بڕیـاردرا بەدامەزرانـدنی پارتێـك بـەناوی (پـارتی دیمـوکراتی کـورد) زۆربـەی ئەندامـەکانی لەهەردوو پارتی هەڵوەشاوە پێکهاتبوو پـارتی (ڕزگـاری وشـۆرش) لەوکۆنگرەیـە مەلا مستەفا کرا بەسەرۆکی پارت و شـێخ لـەتیف شـێخ مـەحمود کـرا بـەجێگری یەکەمی سەرۆك[٣٩]، مەلا سەید حەکیم خانەقینی وەکو نوێنەرێك بەشدار بوو لـەو کۆنگرەیەدا کەداوای کرد لەنـەریمان بێتـە ڕیـزی ئـەم پارتـەوە ئـەویش ئامـادەی خۆی دەربڕی[٤٠]، نەریمان لـەوناو پارتیـدا زیـاتر بەلایـەنی ڕۆشـنبیریەوە خـەریك بوو، لەساڵی ١٩٥٣ لەکەرکوك کۆنگرەی سێیەمی پارتی دیموکراتی کورد بەسـترا بەئامادە بوونی مەلا مستەفا بارزانی بڕیاردرا بە گۆڕینی ناوی (پارتی دیمـوکراتی کورد) بۆ(پارتی دیموکراتی کوردستان) بۆئەوەی هەموو خەڵك بتوانن ببنە ئەندام وە ناوی زمان حاڵی پارتی گۆڕا لـە(ڕزگـاری) بـۆ(خـەبات) چـەند بڕیـارێکی تـری تایبـەت بەحیزبەکـەدرا[٤١]، لـە ١٤ی تـەمموزی ١٩٥٨ شۆرشـێك بەسـەرکردایەتی (عەبدول کەریم قاسم ١٩٥٨-١٩٦٣) بەسـەرکەوتویی کـرا کـە ڕژێمـی پاشـایەتی کۆتـایی هات و ڕژێمی کۆماری کرا بەسیستەمی سیاسی لـەعێراق، وەفـدی پـارتی بەسەرکردایەتی برایم ئەحمەد دەچێتە بەغدا نەریمانیش لەگـەڵ وەفدەکـەدا بـوو لە٢٧ تەمووز دەچـێنە لای عەبـدول کـەریم قاسـم بـۆ پیرۆزبـایی کردنـی شـۆرش

وپێشکەش کردنی داواکارییەکانی گەلی کورد وهەروەها لەگەڵ حەوت مامۆستادا یاداشتێکیان دا بەشۆرش بۆ مافی خوێندنی کوردی لە کوردستان[٤٢].

برایم ئەحمەد داوا لەنەریمان دەکات بچێتە ناوچەی کفری وەکو نوێنەری پارتی لەناوچەکەدا بۆئەوەی بتوانێت خەڵکی بهێنێتە ڕیزی پارتیەوە ئەویش ئامادەی خۆی دەربڕی توانی پارتی بگەیەنێتە ناوچەکە وەخەڵکی پێشوازیان لێ کرد[٤٣]، لەساڵی ١٩٥٩ لەکەرکوك بوو بە شەڕ لەنێوان کوردو تورکمان کەلەهەردوولا ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کوژران، نەریمانیش لەکەرکوك بوو دەستیان کرد بەپێکێنانی بەرەی نیشتمانی لەحیزبەکانی (پارتی،شوعی،وطنی دیموکراتی)لەگەڵ وەفدەکە دەچێتە لای مەلا مستەفا لەبەغدا بۆ چارەسەری کێشەکە دواتر چووە لای وەکیلی سەرۆك کۆمار لەبەغدا بۆ چارەسەری کێشەکە نەیانهێشت شەڕەکە پەرەبسێنێت [٤٤]، عەبدول کەریم قاسم لەسەر سیاسەتی خۆی نەمایەوە لەساڵی ١٩٦١کەوتە بیانوو گرتن لەپارتی چەند کادرێکی پارتی لەبەغدا دەستگیر کرا مەلا مستەفاش بەغدای بەجێهێشت گەڕایەوە ناوچەی بارزان[٤٥]، هەڵمەتی گرتنی کادیرانی پارتی بەردەوام بوو لەئازاری ١٩٦١ دەچنە سەر ناوچەی کەرکوك چەند کەسێك دەستگیر دەکەن و نەریمانیش دەستگیر دەکرێت ڕەوانەی بەغدا دەکرێت بەبێ دادگا کردن ڕەوانەی بەندیخانەی جەلەولا دەکرێت کەنزیکەی هەزار زیندانی تێدابوو[٤٦]، کوردیش دەستی کرد بەدژایەتی کردنی حکومەتی عەبدول کەریم قاسم شۆرشی کورد لە١١ی ئەیلولی ١٩٦١ بەرپا بوو دژی حکومەت[٤٧]، نەریمان بۆماوەی سێ مانگ هاتوو چۆکردنی قەدەغە بوو هێچ کەسێك نەیدەتوانی سەردانی بکات، (٦٠)کوردی تر لەگەڵی بوون لەزینداندا توانی لەگەڵ (٢٠) کەسیان ڕێکخراوێکی نهێنی پێکبهێنن لەڕێگەی ئەفسەرێکەوە پەیوەندیان لەگەڵ دەرەوەدا هەبێت، پاش چەند مانگێك باوکی پارێزەری

بۆدەگرێت بەلام بێ ئەنجام بوو چونکە بەپێی هیچ مادەیەکی یاسایی نەگیرابوو تەنها لەسەر کوردایەتی بوو دوای شەش مانگ زیندانی ئازاد کرا،ئەوەش دوای ئەو لێبوردنە گشتیە بوو کە عەبدول کەریم قاسم لەساڵی ۱۹٦۱ دەریکرد بۆ ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ کوردا داوا دەکات لەبارزانی بێت بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ(٤٨)، نەریمان گەڕایەوە بۆ شاری کەرکوك بە فەرمانێکی سەربازی بۆشاری (کوت)دوور دەخرێتەوە لەساڵی ۱۹٦۱ وەکوردێکی زۆر بۆ ناوەراستی عێراق دوور خرانەوە لقی(٥)ی بەغدا داوای لەکادیرانی کرد بەردەوام بن لەسەر هەڵویستی خۆیان چالاکی سیاسی ونهێنی ئەنجام بدەن نەریمان چالاکی باشی ئەنجام دا پلەکەی بەرز کرایەوە بۆ لێپسراوی ناوچەی کوتی(پ.د.ك)(٤٩)، ئەم بارودۆخە بەردەوام نەبوو لەشوباتی ۱۹٦۳ بەعسیەکان بەسەرکردایەتی (عەبدول سەلام عارف ۱۹٦۳-۱۹٦٦) توانیان عەبدول کەریم قاسم لەدەستەلأت لابدەن و خۆیان جلەوی دەسەلأت بگرنە دەست لەگەڵ کورد رێکەوتن، زۆربەی زینداشیە سیاسیەکان ئازاد کران ئاهەنگی نەورۆز لەبەغدا کرایەوە، شاندی کوردی چووە بەغدا بۆگفتوگۆ لەگەڵ عەبدول سەلام عارف لەساڵی ۱۹٦۳ نەریمانیش چووە بەغدا بۆئەو کۆبونەوەیە بەلأم بەهۆی تێکچوونی پەیوەندی کورد و حکومەت شاندەکە گەڕایەوە نەریمان بەنهێنی گەڕایەوە بۆ کوت بەلأم داواکراو بوو لەکاتی دەوامی فەرمی لەقوتابخانە دەستیگردەکرێت ئازارێکی زۆر دەدرێت ڕەوانەی بەندیخانەکرا داوای لێ دەکەن ناوی هەموو ئەو کەسانە بدات کەوا پارتین لەکوت بەلأم هەر ئیعترافی نەکرد، ئەمری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت دەبرێتە ژووری تاکەسی ماوەیەك ئەمرەکەی جێبەجێ ناکرێت لەئابی ۱۹٦۳ بەڕێوەبەری زیندانیەکەیان دەگۆڕێت بەڕێوەبەرێکی نوێ دێت دەڵێت (بەچی هۆیەك ئەمری لەسێدارەدانت

بۆدەرچووە)[50]، دوای مانەوەی چوار مانگ لەزیندان دەڵێت (کەسێك بەناوی(ح)هات ولەزیندان ڕزگاری کردم)[51].

دوای ئازاد کرنی دەگەڕێتەوە بۆمامۆستایەتی، لەساڵی ١٩٦٥(ئەنوەر سامر)دەبێتە پاریزگاری رومادی کەزاوای عەبدول سەلام عارف بوو کۆمەڵێك خەلك دەسگیر دەکات لەنیسانی ١٩٦٥ نەریمان بۆجاری سێەم دەستگیر دەکرێت رەوانەی زیندانی(رومادی) دەکرێت دوای دوو مانگ لەحوزەیرانی ١٩٦٦ بەهۆی لێبوردنی گشتیەوە ئازاد دەکرێت ، لە سەردەمەدا لەمامۆستایەتی فەسڵ کرابوو لەساڵی ١٩٦٧دەچێتە بەغدا، بۆماوەی ساڵ ونیۆێك فەسڵ کرا دواتر دەگەڕێتەوە بۆمامۆستایەتی، سێ جار دەستگیر کرا لەسەر هەڵویستی سیاسی و کوردایەتی بەلاّم ئامادە نەبوو ناوی کەس بدات دڵسوزێکی گەورەی پارتی بوو، لەساڵی ١٩٦٦نەریمان بڕیاریدا واز لەکاری حیزبایەتی و سیاسی بهێنێت ئەمەش بەهۆی جیاوازی بیرو بۆچوون لەناوپارتەکەدا، وەکو کوردێك چووتە بەغدا بەبواری ئەدەبی و ڕۆشنبیریەوە خەریك بوو.

## بەشی سێیەم/ ڕۆڵی مستەفا نەریمان لەبواری ڕووناکبیریدا

کۆتایەکانی سەدەی نۆزدە وسەرەتاکانی بیست کوردستان بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری و نەتەوەیی بەخۆەوە بینی بۆیەکەم جار ڕۆژنامەیەکی کوردی لەساڵی ١٨٩٧ بەناوی (ڕۆژنامەی کوردستان)دەرچوو،هەروەها لەسەرەتای سەدەی بیست کۆمەلێك گۆڤارو ڕۆژنامە دەرکران بەمەش شەپۆلێکی ڕۆژنامەنووسی لەناوچەکە هاتەئاراوە، لەکوردستانی باشووریش(عێراق) کۆمەڵێك گۆڤارو ڕۆژنامە دەرچوو، هەروەها هاتنی چاپ وکردنەوەی قوتابخانە ودامەزراندنی ڕادیۆ لەبەغدا بواری ڕۆشنبیری فراوانتر کرد، لەسەرەتای چلەکاندا کۆمەڵێك شاعیرونووسەری

بەتوانادەرکەوتن کەتوانیان خەلکی بەرەوخوێندن هان بدەن، لەوانە (پیرەمێرد)و (برایم ئەحمەد) نەریمان لەبەغدا قوتابی دەستی کرد بەخوێندنەوەی گۆڤارو رۆژنامەکوردیەکان بەتایبەتی گۆڤاری گەلاوێژ، زمان کیلیکە بۆ کردنەوەی دەرگاکانی زانست نەریمان جگە لەزمانی کوردی زمانی عەرەبی و تورکی بەباشی زانیوە هەندیك ئینگلیزیشی زانیوە چونکە زۆربەی بلاوکراوەکانی ئەو سەردەمە بەعەرەبی و کوردی بووە، ئەمەش بەهۆی بارودۆخی سیاسیەوە بووە، نەریمان توانیەتی (٢٣)کتێب بەچاپ بگەیەنێت، ئەم بەشەش بۆ چەند تەوەرێك دابەش دەبێت.

## تەوەری یەکەم/ یانەی سەرکەوتنی کوردان

دوای نائومێدی کوردەکان لەکاری سیاسی هەندێ لەرۆشنبیران و سیاسەتمەداران دەستیان کرد بەخەباتی رۆشنبیری وفەرهەنگی و زانستی و پەروەردەو فێرکردن [٥٢]، لەسەر داوای مەعروف جیاووك (١٨٨٥-١٩٥٨) وەزارەتی ناوخۆ بەنووسینی ژمارە(٦٨٩٥) ی ٢٠مارسی ١٩٣٠ رەزامەندی پیشاندا بەکردنەوەی یانەکە، لەرۆژی ٣٠ی مارس ١٩٣٠ لەبەغدایانەکە کرایەوە، ئیبرایم حەیدەری (١٨٦٤-١٩٣١) کرا بەسەرۆکی یانە و مەعرووف جیاووك کرا بەباوەربێکراوی گشتی یانەکە [٥٣]، ئامانجی یانەکە بۆ خزمەتی چینی رۆشنبیران وقوتابیان و ئەنجامدانی کۆرو سمینارو چالاکی ئەدەبی و فەرهەنگی و دانانی کتێب و وەرگێرانی کتێب هەروەها پێشوازی کردن لەقوتابیە کوردەکان لەبەغدا ودابین کردنی شوێن بۆیان، یانەکە کتێبخانەیەکی باشی هەبوو وە مانگی جارێك ئاهەنگی یەکتر ناسینی سازدەکرد [٥٤]، سالی ١٩٥٧ ژمارە یەکی

گۆڤاری(هیوا)یان دەرکرد کەگۆڤارێکی زانستی و ئەدەبی بوو وە دوا ژمارەی (٣٦)لە حوزەیرانی دەرچوو[٥٥].

نەریمان لەساڵی ١٩٤٢ لەبەغدا قوتابی خانەی مامۆستایان بوو هاوکات ئەندامی پارتی هیوا بوو کەپەیوەندیەکی باشیان لەگەڵ یانەی سەرکەوتنی کوردان هەبوو ەدەستی کرد بەهاتووچۆ کردنی یانەکە پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ مەعرووف جیاووك هەبوو، لەساڵی١٩٤٤ لەهەڵبژاردنی یانەکە ئامادە بوو هەموو ڕووداوەکانی تۆمار کردووە، کاتێك مەعرووف جیاووك بۆ باربۆ کردن بەکوردستاندا گەڕاوە لە٢٢تەمموزی ١٩٤٣ گەیشتووەتە کفری نەریمان یاوەری کردووە بەهەموو ناوچەی کفری بۆ وەرگرتنی باربۆ خەڵکی هانداوە بۆیارمەتی دانی یانەکە لە ١٢حوزەیرانی ١٩٦٤ یانەکە داخرا[٥٦]، گرنگترین کاری نەریمان دانانی کتێبك بوو بەناوی (یانەی سەرکەوتنی کوردان) بە ڕەسەنترین سەرچاوە دادەنرێت بۆ دراسەکردنی یانەکە.

## تەوەری دووەم/ بەرهەم و دانراوەکانی

### ١- بواری ببیلۆگرافیا Bibliography

ببیلۆگرافیا وشەیەکی لێکدراوی کۆنی یۆنانییە لەدووبەش پێکهاتووە،(ببیلۆف )واتەکتێب (گراف) واتە نووسین بەمانای (زانیاری نووسین لەسەر کتێب)[٥٧] کاری پێڕستکاری و ببیلۆگرافیا لەناو کورداتازەیە ئەو کارە خزمەتێکی زۆر بە توێژەران و لێکۆڵەران نووسەران و ڕۆشنبیران دەگەیەنێ کارئاسانی زۆرباشیان بۆدەکات لەگەڕان وپشکنین ودۆزینەوەی سەرچاوەکان، هەروەها زانیاری پوختیش لەبواری ڕۆشنبیری دەخاتە ڕوو. نەریمان لەبواری ببیلۆگرافیادا پێشەنگی ئەو کەسانەیە لەکوردستانی(باشوور)عێراق گرنگیان بەم

بواره دابێت و کتێبی تایبەتیان نووسی بێت. یەکەم کۆنگرەی جیهانی لەم بوارەدا لەپاریس لەساڵی ١٩٥٠ بەسترا بەئامانجی ئەوەی هەر ولاتێك بۆکتێبەکانی ببیلۆگرافیایەك دابنێت، لەکانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ لەبەغداد دووەم کۆنگرەی عەرەبی لەبواری ببیلۆگرافیای کتێبی عەرەبی بۆماوەی( ١٠)ڕۆژ بەسترا نەریمان ئەندامی ئەم کۆنگرەیەبوو بەکردار ڕۆڵی هەبووە[٥٨].

نەریمان (٨) ببیلۆگرافیای بۆ کتێب و ڕۆژنامەوگۆڤار ئامادە کردووە (٥) دانەیان تایبەتن بۆ کتێبە کوردییەکان کە(١)دانەیان بەعەرەبیە(٣) دانەیان بۆڕۆژنامەوانیە، ببیلۆگرافیاکانی بەچەند شێوەیەك پۆلێن کردووە. کەناوی کتێبەکان و ناوی نووسەرەکان و ناوی چاپخانە وساڵی چاپ و ژمارەی لاپەڕەکانی تۆمار کردووە،زانیاریەکی باش دەدات دەربارەی ئەو کتێبانەی کەئێستا لەناو چوون، زۆربەی ڕۆشنبیران نووسەرانی ئەو سەردەمەدەست خۆشی ئەو کارەیان لێ کردووە لەوانە(شێخ محەمەدی خاڵ، مارف خەزنەدار،شاگرفەتاح،سجادی،..) لەم ببیلۆگرافیانەپێکهاتووە:

١- کتێبخانەی کوردی.

٢- ببیلۆگرافیای کتێبی کوردی.

٣- ما أسداه الاكراد الى المكتبه العربيه

٤- ببیلۆگرافیای دوو سەد ساڵی کتێبی کوردی

٥- فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد.

٦- ببیلۆگرافیای ڕۆژنامەی هاوکاری .

٧- ببیلۆگرافیای گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ.

٨- ببیلۆگرافیای گۆڤاری بەیان.

## ٢- بواری ئەدەبی و ڕۆشنبیری گشتی

مستەفا نەریمان وەکو زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد سەرەتا بەشیعر دەستی کرد بەنووسین دواتر ڕوویکردۆتە بوارەکانی مێژوویی و ڕۆژنامەوانی و شانۆگەری جێی پەنجەی بەسەر ڕۆشنبیری کوردی دیارە، بەم شێوەیە پۆلێن دەبێت.

١- هاواری لاوان(شیعر).

٢- وشەی کوردی لەهەڵمەتی نیشتمانی گشتی نەهێشتنی نەخوێندەواری.

٣- شاعیری چەوساوەکان (خەلیل منەوەر).

٤- دیوانی مینە جاف.

٥- ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوورو پشتی.

کۆمەڵێك کتێبی تر.

## ٣- بواری مێژوویی

مستەفا نەریمان لەبواری نووسینەوەی مێژوودا چ بەشێوەی تایبەتی بێت یا گشتی کتێبی مێژوویی داناوە، زۆربەی ڕووداوەکانی ژیانی خۆی بەدەست نووس تۆمار کردووە کەزانیاری و ڕاستی مێژوویی زۆریان تێدایە بەسەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت بۆ مێژوویی شاری کفری و ئەو سەردەمە. کەلەم کتێبانە پێکدێت:

أ- مامۆستای نەمر: ئەم کتێبە باسی ژیاننامەی مامۆستا ومەلا کاکە حەمەحاجی سیف اللە دەکات کە بڕیاریداوە لەناوچەرگەی نەخوێندەواری لەگوندو دێهاتەکانەوە بکەوێتە جەنگی نەخوێندەواری چرای زانست هەڵبکات ئەویش ناوچەی داودەی گەرمیان بوو لەساڵی ١٩٢٦-١٩٥٦ خەریکی دەرس وتنەوە بوو نەریمان پەیوەندیەکی باشی لەگەڵی هەبوو لەساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردوە[٥٩].

ب- بیرەوەریەکانی ژیانم: ئەم کتێبە یاداشتەکانی نەریمان خۆیەتی کە چەند ڕۆژێك پێش مردنی لە بەغدا چاپی کردووە کە هەموو ڕووداوەکانی ژیانی خۆی و مێژوویی ناوچەی کفری و هەروەها بارودۆخی کوردستان و عێراق تۆمارکردووە، کەبەسەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگ دادەنرێت بۆ مێژووی هاوچەرخ و بواری ڕۆژنامەگەریی[٦٠].

ت- یانەی سەرکەوتنی کوردان: ئەم کتێبە دەست نووس بوو لای مامۆستا(ئازاد هیدایەت دەلۆ) پارێزراوە نەریمان نەیتوانی چاپی بکات لەساڵی ٢٠٠٦ لەکەرکوك چاپ کراوە، باسی مێژووی یانەی سەرکەوتنی کورد و ژیانی مەعرووف جیاوگ دەکات بەسەرچاوەیەکی ڕەسەن دادەنرێت بۆ لێکۆلینەوەی لە یانەی سەرکەوتن[٦١].

پ- شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ١٩٢٠:بە کتێبێکی مێژوویی گرنگ دادەنرێت بەتایبەتی بۆ خەباتی ناوچەی گەرمیان و کفری لەدژی داگیرکەری بەریتانی بۆ کوردستان، برایم خانی دەلۆو شۆرشگێرەکان توانیان شارەکە ڕزگار بکەن لەدەستی ئینگلیزەکان، زۆربەی سەرچاوەکانی ئەم کتێبە کەسانی ناو ڕووداوەکانی شۆرشەکەن نەریمان چاو پێکەوتنی لەگەڵ کردوون تۆماری کردووە، دووجار چاپ کراوە[٦٢].

## تەوەری سێیەم /دانان و وەرگێرانی کتێبی قوتابخانەکان

نەریمان دوای ساڵانێکی زۆری خزمەتی لەبواری پەروەردەیی و مامۆستایەتی لەسەر داوای بەرێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی لەوەزارەتی پەروەردەی عێراق لەماوەی (١٩٧١-١٩٨٥)دەستی کرد بەدانان و وەرگێرانی کتێب بۆ پرۆگرامەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و توانی (١٧)کتێب بۆ

پرۆگرامەکانی خوێندن دابڕێژێت و وەربگێڕێت لەبوارەکانی (زمانی کوردی، بیرکاری، مێژوو، جوگرافیا،.. هتد)[٦٣].

## تەوەری چوارەم / بواری ڕۆژنامەوانی

نەریمان جگەلەوەی مامۆستا و نووسەر بووە لەبواری ڕۆژنامەوانی کاری کردووە لەچەند گۆڤارێك و بووەتە بەڕێوەبەرو سكرتێری نووسینی چەند گۆڤارێك لەزۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە گۆشەی تایبەتی هەبووە بابەتی نووسیووە لەبوارەکانی (مێژوویی، ئەدەبی، ڕۆشنبیری گشتی) بووە لەم گۆڤارانە کاری ڕۆژنامەوانی کردووە .

١- گۆڤاری بەیان: ئەم گۆڤارە لە ت٢ سالّی ١٩٦٩ دەرچووە دوای ئەوەی سەرنووسەر (د.ئەکرەم فاضل) کەبەڕێوەبەری کەلەپووری نیشتمانی بوو داوای لە نەریمان کرد ببێتە سکرتێری نووسین لەژمارە(٩)ی سالّی ١٩٧٣ بووە سکرتێری نووسین ئەرکی تیّ هەلّچوون و راستکردنەوەو نووسەر بوو هەتا لەژمارە(٢٥)ی سالّی ١٩٧٥، پاش ئەوە بووە بەدەستەی نووسەران کۆمەلّێك بابەتی بلاوکردەوەتەوە[٦٤].

٢- گۆڤاری ڕەنگین: ئەم گۆڤارە لە سالّی ١٩٨٧ یەکەم ژمارەی دەرچووە لەلایەن دەزگای ڕۆشنبیری و بلاّوکردنەوەی کوردی یەوە سەرنووسەری (مصلح جەلالی) نەریمان سکرتێری نووسین بووە ، لەژمارە یەکەوە هەتا ژمارە(٢٥)ی سالّی ١٩٨٩، پاش ئەوە بوویەوە دەستەی نووسەران توانیویەتی ڕەنگین بەبابەتەکانی دەولەمەند بکات گۆشەی تایبەتی هەبووە بەناوی (ئێمە و دەست و خامە ڕەنگینەکان ) بابەتی مێژوویی و دیدارو گفتۆگۆی ئەنجام داوە لەگەلّ کۆمەلّێك کەسایەتی سیاسی و هونەری لەوانە (لەتیف هەلّمەت، د.ئەورەحمانی

حاجی مارف، ژیانی رەفیق حیلمی، عبدالله سەراج) هەتا مردنی لەدەستەی نووسەران بووە.

٣- گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ: نەریمان لەم گۆڤارە کاری ڕۆژنامەوانی کردووە لەساڵی ١٩٨٩ بووە بەسکرتێری نووسین هەتا ساڵی ١٩٩٢ لەم ماوەیەدا توانیویەتی کۆمەڵێك بابەتی جۆراو جۆر بڵاوبکاتەوە و خزمەتی ڕۆژنامەگەری کوردی بکات[٦٥].

لیستی کتێبە چاپ کراوەکانی مستەفا نەریمان

| ز | ناوی کتێب | ساڵی چاپ |
|---|---|---|
| ١ | هاواری لاوان(شیعر) | ١٩٥٣ |
| ٢ | هەڵبەست بۆ قوتابیان(شیعر) | ١٩٥٥ |
| ٣ | عەلی ئەفەندی(شانۆگەری) | ١٩٥٨ |
| ٤ | روخا(شانۆگەری) | ١٩٥٩ |
| ٥ | کتێبخانەی کوردی(ببیلۆگرافیا) | ١٩٦٠ |
| ٦ | مامۆستای نەمر | ١٩٧١ |
| ٧ | ببیلۆگرافیای کتێبی کوردی | ١٩٧٧ |
| ٨ | توێژینەوەیەك لەپێنج بەهرەی نجم الدین مەلا | ١٩٧٩ |
| ٩ | پێویستیە کۆمەڵایەتیەکانی سەر شانی بەڕێوەبەر | ١٩٧٩ |
| ١٠ | وشەی کوردی لەهەلمەتی نیشتمانی وە نەهێشتنی نەخوێندەواری | ١٩٧٩ |
| ١١ | رێنوسی کوردی لەڕەگ و ریشەوە | ١٩٨١ |
| ١٢ | ببیلۆگرافیای گۆڤاری رۆشنبیری | ١٩٨٢ |
| ١٣ | ببیلۆگرافیای گۆڤاری بەیان | ١٩٨٣ |
| ١٤ | ما أسداه الاکراد الی المکتبە العربیە | ١٩٨٣ |
| ١٥ | شاعری چەوساوەکان(خەلیل منەوەر) | ١٩٨٤ |
| ١٦ | فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد | ١٩٨٦ |
| ١٧ | شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠ | ١٩٨٧ |
| ١٨ | ببیلۆگرافیای دوو سەد ساڵی کتێبی کوردی | ١٩٨٨ |
| ١٩ | ببیلۆگرافیای رۆژنامەی هاوکاری | ١٩٨٩ |
| ٢٠ | دیوانی مینە جاف | ١٩٩٠ |
| ٢١ | بیرەوەریەکانی ژیانم | ١٩٩٤ |
| ٢٢ | یانەی سەرکەوتنی کوردان | ٢٠٠٦ |
| ٢٣ | ئەدیب و نووسەرانی کفری دەوروپشتی | ٢٠٠٧ |

**دەرئەنجام :**

لەم لێکۆڵینەوەدا گەیشمە ئەم را و بۆچوونانەی لای خوارەوە :

١- مستەفا نەریمان هەرچەند لە سەردەمێکی ناهەموار و لە شارێکی فەرامۆشکراودا ژیاوە ، بەلام بەربەرەکانی نەهامەتی و سەختییەکانی ژیانی کردووە و هەر لە منداڵییەوە توانیەویەتی وەکو خاوەن خامە و پێنووسێك بەدەر بکەوێت و رۆڵ لە بواری نوسیندا ببینێ .

٢- هەمەجۆری و هەمە چەشنی لە نووسینی بابەتی کتێبەکان و نوسینی لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا کە بابەتی مێژووی و رۆشنبیری و ئەدەبی لە خۆ دەگرێت ئەمەش توانا و بەهرەمەندی ئەو جوامێرە دەخاتە روو لە بواری نووسیندا .

٣- هەوڵ و تەقەلای بێوچانی نەریمان لە بواری رۆژنامە و گۆڤارەکاندا توانی تەکانێك بەرۆژنامە و گۆڤاری کوردی دات و بەرەو پێشی ببات و جێگای پەنجەی لە رۆژنامە و گۆڤاری ئەو سەردەمە بەدەر بکەوێت .

٤- لە بواری پەروەردە و وەرگێرانی پرۆگرامەکانی خوێندنی قوتابخانەکاندا چالاك و بەتوانا و لێهاتوو بوو توانی چەندین خزمەتی گەورە بە کاروانی پەروەردە و فێرکردنی خوێندنی کوردی بکات .

٥- لە رووی سیاسیەوە کوردێکی بە هەڵوێست و خاوەن بیروباوەڕی کوردانە و نیشتمان پەروەری بوو لە پارتەکانی ئەو سەردەمەدا کاری کردووە و دووچاری نەفی و ئازار و ئەشکەنجە و دورخستنەوە و فصل کرنن بووەتەوە .

پەراوێزەكان:

(١) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەكانی ژیانم، بەغداد، ١٩٩٤، ل٢٣-٢٤.

* كفری، شارێكی كۆنی كوردستانی باشوورە،دەكەوێتە باشووری ڕۆژهەلاتی كەركوك بە١٠٠كم. بروانە،سهیل خورشید عزیز، صفحات من تاریخ منطقة كفری،سلیمانیة،٢٠٠٢، ص٨٦.

(٢) مستەفا نەریمان،ئەدیب ونووسەرانی كفری و دەوروپشتی، بەغداد،٢٠٠٧، ل ٢٨٤.

(٣) سالح هەلاج،گوڵبژێریك لەشیعروشاعیرانی گەرمیان، كەركوك، ٢٠٠٨، ل١٤١.

(٤) وریا صالح، ساتێك لەگەڵ كاروانی پرسەروەری نووسەر و مێژوونووسی بەناوبانگ مستەفا نەریمان. شەن (گۆڤار)، ژ(٤-٥)٢٠٠٢، ل ٤٥.

* موكەڕەم تاڵەبانی: لەساڵی١٩٢٣ لەكەركوك لەدایك بووە، كۆلێژی مافی لەبەغدا تەواو كردووە دكتۆرای لەئابووری بەدەست هێناوە، لەدامەزرێنەرانی كۆمەڵەی داركەرو پارتی هیوایە، وەئەندامی حیزبی كۆمۆنیستی عێراقی بووە، چەند جارێك پایەی وەزیری وەرگرتووە لەحكومەتی عێراقی، ئێستا لەسلێمانی نیشتەجێ یە، ئازاد هیدایەت دەلۆ: دیداری رۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٥، ل٢٠٦-٢٠٧.

(٥) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەكانی ژیانم، ل٢٩.

* ژین: ڕۆژنامەیەكی وێژەیی كۆمەڵایەتی هەفتانەی كوردی بوو لەسلێمانی لەلایەن (پیرەمێرد) ەوە دەركرا ژمارە یەكی لە٢٦/١/١٩٣٦ دەرچووە هەتا شوباتی ١٩٦٣ بەردەوام بوو، ئازاد عوبید سالح، كاریگەری شۆرشی ئەیلول لەسەر ڕۆژنامەوانی ١٩٦٣-١٩٧٥،هەولێر،٢٠٠٧، ل٣١٩.

(٦) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەكانی ژیانم، ل ل٥٣،٥٧-٥٨.

* خانەی مامۆستایانی بەغدا، پێی دەوترا (دار المعلمین الابتدائیه) تەنها لەبەغدا هەبوو دەرچووانی ناوەندی وەردەگرت دوای سێ ساڵ دەبوونە مامۆستای سەرەتایی.

(٧) مصطفی احمد محمد، نریمان مناضلا ومربیا ومؤرخا، (الناقوس) (جریدة) ، عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧، ص٣.

(٨) مستەفا سەید احمد، ئاوازێك لەنەوجوانێكەوە،(گەلاوێژ) ( گۆڤار)، ژمارە(١٠)، ساڵی ١٩٤٣، ل ٦٠-٦١.

(٩) قیس قرەداخی، في رحاب ذكری (مصطفی نریمان)، (الناقوس) (جریدة)، عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧، ص ٢.

* برایم حەمە خانی گێژ(١٨٨٥-١٩٦٨): شۆڕە سوارێكی كورد بوو لەناوچەی نارین لەساڵی ١٩١٨ لەگەڵ دوو كوردی تر توانیان ڕێگە لەهاتنە پێشەوەی ئینگلیزەكان بگرن بۆماوەیەك بەرگریان كرد لەهاتنە پێشەوەی ئینگلیزەكان بەرەو شاری كفری دواتر بریندار بوو. بەبرینداری هەڵهات. مستەفا

نەریمان، کوردێکی شۆڕە سوار برایم حەمەخانی گێژ، (ڕەنگین) (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە(٥٤)،١٩٩٣، ل١٤.

(١٠) عومەر عەلی شەریف: مستەفا نەریمان چەند بیرەوەریەکی کەرکوك، (نەوشەفەق) ( گۆڤار)، کەرکوك، ژمارە(٢)، ئاياری ٢٠٠٣، ل٦٦.

(١١) اعداد جريدە الناقوس، مصطفی نريمان وقصتة مع اول مفكرة جيب كردية،(الناقوس) ( جريدة)،عدد(٤)،٢٠٠٧/٥/٢٦، ص ٤.

(١٢) دیدارلەگەڵ سەید فاتح سەید ئەحمەد،(سەید فاتح)لە ساڵی ١٩٤٤لەکفری لەدایك بووە ، مامۆستایە ئێستا لەهەولێر نیشتەجێیە، برای نەریمانە، دیدار، هەولێر،٢٠٠٩/١٢/٢٣.

(١٣) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل١٤١–١٤٧.

(١٤) مستەفا نەریمان، سێ جار بەخزمەتی شێخ گەیشتوم،(ڕەنگین)(گۆڤار)، ژمارە(١)،١٩٨٧، ل٢٨–٢٩.

(١٥) وریا صالح، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.

(١٦) ((ڕەنگین))، ژ(٦٧)،١٩٩٤، ل٢.

(١٧) دیدارسەید فاتح سەید ئەحمەد، هەولێر،٢٠٠٩/١٢/٢٣.

(١٨) مكرم سيد احمد البرزنجي،مكتبە مصطفی نريمان من بغداد الی كرميان،،((الناقوس))،عدد(٤)،٢٠٠٧، ص ٤.

(١٩) ئازاد هیدایەت دەلۆ،مژدەیەك بۆکوردستان،((ڕەنگین))، ژ(١٢٠)،١٩٩٩، ل٢٧.

* ڕەفیق حیلمی: لەساڵی ١٨٩٨ لەکەرکوك لەدایك بووە، ڕوشدییەی مولکیەی کفری تەواو کردوە پاش ئەوە ئامادەیی تەواو کردوە، هەندەسەی عالی لەئەستەنبول تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٣٩–١٩٤٥ سەرۆکی باڵای پارتی هیوابووە،وەسەرپەرەشتیاری پەروەردەی بوو، لەساڵی ١٩٦٠کۆچی دوایی کردوە، ناهیدە ڕەفیق حلمی، بەسەر هاتی ڕەفیق حلمی، بەشی یەکەم، سلێمانی،٢٠٠٥، ل٢٣–٢٦.

* کەلار/ ئەو کات دێیەك بوو لەلایەن جافەکانەوە بەڕێوەدەبرا سەربەقەزای کفری بوو.

(٢٠) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٧٥.

(٢١) وریا صالح، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.

(٢٢) مستەفا نەریمان، ئەدیب ونووسەرانی کفری و دەوروپشتی، بەغداد،٢٠٠٧، ل ٢٨٦.

* یونس ڕەئوف(دڵدار): ناوی یونسی کوڕی مەلا ڕەئوفی مەلا مەحمودە لەساڵی ١٩٢٠ لەکۆیە لەدایك بووە،قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیەو ڕانیە تەواو کردوە لەهەولێرو کەرکوك ناوەندی و ئامادەیی

تەواو کردوە وەکۆلێجی مافی لەبەغدا تەواوکردوە ، بووەتەپارێزەر، لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەی دارکەر بوولەساڵی١٩٣٧ ئەندامی پارتی هیوابوو، لەساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردوە،د.مارف خەزنەدار،مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، هەولێر،٢٠٠٩، ل٥٣٧-٥٣٨.

(٢٣) د.موکەرەم تالەبانی،کۆمەڵەی دارکەرو پارتی هیوا چۆن دامەزرا،((ڕەنگین))، ژمارە(٥٢)،١٩٩٣، ل١٨-٢٠.

(٢٤) هـ. س . پ، ل٢٠.

(٢٥) د. سروە اسعد صابر، کوردستان الجنوبیە ١٩٢١-١٩٣١ دراسە تاریخیە سیاسیە،سلیمانیە،٢٠٠٦، ص٣٦٧. فەیسەڵ دەباغ، حیزبی هیواو شۆرشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان، هەولێر،١٩٩٧، ل١٤-١٥.

(٢٦) د.موکەرەم تالەبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠.

(٢٧) فاتیح ڕەسول، بنچینەی مێژوویی بیرۆکەی چەپ لەکوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٨.

(٢٨) صلاح الدین عبدالحمید عبدالله،شاری کفری لەتەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانیەتیدا،سلێمانی،٢٠٠٩، ل٤٠.

(٢٩) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٧٥.

(٣٠) د.عبدالستار طاهر شریف، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیة فی نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، بغداد،١٩٨٩، ص١٠٠.

(٣١) ن . م ، ص١٠٣.

(٣٢) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٨٨.

(٣٣) د.عبدالستار طاهر شریف، م . ص، ص١٠٥.

(٣٤) حسین اسماعیل عزیز، ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی(١٩١٤-١٩٤٥)، نامەیەکە پێشکەش بەبەشی مێژوویی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆیی سەلاحەددین /هەولێرکراوە، حوزەیرانی،٢٠٠٩. ل٩٩-١٠٠.

(٣٥) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٨٦-٨٧.

*گێژ:عەشیرەتێکە لەناوچەی گەرمیان لەکۆمەڵێك تیرە پێکهاتوون وەلەناوچەی بادینان بەگۆران ناسراون.

(٣٦) هـ. س . پ. ل٨٤.

* ڕزگاری کورد: ئەم پارتە لەمانگی شوباتی ١٩٤٥ لەلایەن کۆمەڵێك لەڕووناکبیران وئەندامانی پارتی شیوعی عێراقی و پارتی هیوا هەندێك لە لاوان و قوتابیان دامەزرا،خاوەن بەرنامەی تایبەتی بوو لقی لەزۆربەی شارەکان هەبوو نزیکەی ٤-٥ هەزار ئەندامی هەبوو، دژی ئیستعمار بوو، لەمانگی شوباتی ١٩٤٦ هەڵوەشایەوە زۆربەی ئەندامەکانی چوونە نێو پارتی دیموکراتی کوردەوە.

(٣٧) عبدالرحمن قاسملۆ و عبدالله حسن زادە،کورتە مێژوویی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، چاپخانەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران،٢٠٠٢، ل٢٧.

(٣٨) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٩١.

(٣٩) مسعود البارزاني، البارزاني والحركه التحرريه الكرديه ثورة بارزان ١٩٤٥-١٩٥٨،كردستان،١٩٨٧، ص٢٩.

(٤٠) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل ٩٢-٩٣.

(٤١) د.كاظم حبيب، لمحات من نظال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، طبعة الثانية،اربيل،٢٠٠٥، ص٢٤٩،٢٥٠.

(٤٢) مستەفا نەریمان، ئەدیب ونووسەرانی کفری و دەووروپشتی، ل٢٨٩.

(٤٣) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل١٥٢- ١٥٣.

(٤٤) كريم حميد عزيز، مصطفى نريمان يروي احداث كركوك عام ١٩٥٩ بشكل تفصيلي و كشاهد عيان،((الناقوس))، عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧. ص٤.

(٤٥) مسعود البارزاني، البارزاني والحركه التحرريه الكرديه ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥،الجزء الثالث،اربيل،٢٠٠٢، ص٢٢.

(٤٦) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل١٧٢-١٧٣.

(٤٧) مسعود البارزاني، م. س، ص٢٦.

(٤٨) ن . م ، ص٣٣-٣٤.

(٤٩) دیدار لەگەڵ سەید فاتیح سەید ئەحمەد،هەولێر،٢٣/١٢/٢٠٠٩.

(٥٠) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٢٠٧.

(٥١)هـ.س . پ، ل٢٠٧.

(٥٢) ئازاد عوبێد ساڵح، ڕۆڵی سیاسی وکارگێڕی وڕووناکبیری مەعرووف جیاووك(١٨٨٥-١٩٥٧)، تێزی دکتۆریە، بڵاونەکراوەیە پێشکەش بەبەشی مێژوویی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین هەولێرکراوە: ٢٠٠٨. ل٢٢١.

(٥٣) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، پێداچونەوەو ئامادەکردنی ئازاد هیدایەت دەلۆ،کەرکوك،٢٠٠٦، ل٩ –١٠.

(٥٤) ئەحمەد باوەڕ، کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن، کوردستان،٢٠٠٤، ل٦٨.

(٥٥) مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، ل٦٧.

(٥٦) ئازاد عوبێد سالح، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٥.

(٥٧) مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی (١٧٨٧–١٩٧٥)، بەغدا،١٩٧٧، ل٦.

(٥٨) مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای دووسەد ساڵی کتێبی کوردی (١٧٨٧–١٩٨٦)، بەغدا،١٩٨٨، ل٤–٥.

(٥٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : نەریمان، مامۆستای نەمر، بەغدا،١٩٧١.

(٦٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، بەغدا،١٩٩٤.

(٦١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، پێداچونەوەو ئامادەکردنی ئازاد هیدایەت دەلۆ،کەرکوك، ٢٠٠٦.

(٦٢) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : مستەفا نەریمان، شۆرشی برایم خانی دەلۆ١٩٢٠، چاپی دووەم، هەولێر،٢٠٠٧.

(٦٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : مستەفا نەریمان، ئەدیب ونووسەرانی کفری و دەوروپشتی، ل٢٩٢.

(٦٤) بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: گۆڤاری((بەیان))، ژمارە(٩٢)، تشرینی دووەم/١٩٨٣.

(٦٥) بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: گۆڤاری((ڕۆشنبیری نوێ))، ژمارە(٩٤)،١٩٨٢ .

## سەرچاوەکان:

**یەکەم /نامەی زانکۆیی بڵاونەکراوە**

١- ئازاد عوبێد ساڵح، ڕۆڵی سیاسی وکارگێڕی و ڕووناکبیری مەعرووف جیاووك(١٨٨٥-١٩٥٧)، تێزی دکتۆرایە، پێشکەش بەبەشی مێژوویی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین /هەولێرکراوە، هەلێر،.٢٠٠٨.

٢- حسین اسماعیل عزیز، ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی(١٩١٤-١٩٤٥)، لێکۆلینەوەیەکە لەبارودۆخی رامیاری و کۆمەلایەتی ڕۆشنبیری، نامەی ماستەرە پێشکەش بەبەشی مێژوویی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆیی سەلاحەددین /هەولێرکراوە، هەولێر، حوزەیرانی،٢٠٠٩.

**دووەم /یادشت**

٣- مستەفا نەریمان، بیرەوەری یەکانی ژیانم، دارالحریە، بەغدا،١٩٩٤.

**سێ یەم /کتێب بەکوردی**

٤- ئازاد عوبید ساڵح، کاریگەری شۆرشی ئەیلول لەسەر ڕۆژنامەوانی ١٩٦٣-١٩٧٥، لەبلاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧.

٥- ئازاد هیدایەت دەلۆ: دیداری ڕۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر،٢٠٠٥.

٦- ئەحمەد باوەڕ، کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن، چاپکراوەکانی شارەوانی کەلار، چاپخانەی تیشك، کوردستان،٢٠٠٤.

٧- ساڵح هەلاج، گوڵبژێریك لەشیعروشاعیرانی گەرمیان، چاپخانەی ئاربخا،کەرکوك،٢٠٠٨.

٨- سەلاحەدین عبدولحەمید عەبدوللا، شاری کفری لەتەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانیەتیدا، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٩- عەبدولڕەحمان قاسملو و عەبدوللاحەسەن زادە، کورتە مێژوویی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، چاپخانەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران،٢٠٠٢.

١٠- فاتیح ڕەسول، بنچینەی مێژوویی بیرۆکەی چەپ لەکوردستان، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١١- فەیسەل دەباغ، حیزبی هیوا و شۆرشی ١٩٤٣- ١٩٤٥ی بارزان، دەزگای ڕاگەیاندنی گوڵان، هەولێر،١٩٩٧.

١٢- مارف خەزنەدار(د)،مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٩.

١٣- مستەفا نەریمان، هاواری لاوان، چاپخانەی زانکۆ، بەغدا،١٩٥٣.

١٤- مستەفا نەریمان، کتێبخانەی کوردی، چاپخانەی شارەوانی کەرکوك، کەرکوك،١٩٦٠.

١٥- مستەفا نەریمان، شاعیری چەوساوەکان(خەلیل منەوەر)، چاپخانەی دار الحریە، بەغدا،١٩٨٤.

١٦- مستەفا نەریمان، وشەی کوردی لەهەڵمەتی نیشتمانی گشتی نەهێشتنی نەخوێندەواری لەتەوزیمی دا لەماوەی ٢٢/٥/١٩٧٨-٢٢/٥/١٩٧٩، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨١.

١٧- مستەفا نەریمان، مامۆستای نەمر، چاپخانەی الامە، بەغدا،١٩٧١.

١٨- مستەفا نەریمان، بیلیۆگرافیای کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٧٥)، چاپکراوەکانی کۆری زانیاری کورد، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا،١٩٧٧.

١٩- مستەفا نەریمان، بیلیۆگرافیای دووسەد ساڵی کتێبی کوردی ١٧٨٧ -١٩٨٦، چاپخانەی زەمان، بەغدا،١٩٨٨.

٢٠- مستەفا نەریمان، بیلیۆگرافیای رۆژنامەی هاوکاری ١٩٧٠ - ١٩٧٤، بەشی یەکەم، چاپخانەی دارالحریە، بەغدا، ١٩٨٩.

٢١- مستەفا نەریمان، فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا،١٩٨٦.

٢٢- مستەفا نەریمان، دیوانی مینە جاف، چاپخانەی جاحظ، بەغدا،١٩٩٠.

٢٣- مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، پێداچونەوەو ئامادەکردنی ئازاد هیدایەت دەلۆ، چاپخانەی ئەرەبخا، کەرکوك،٢٠٠٦.

٢٤- مستەفا نەریمان، ئەدیب ونووسەرانی کفری و دەوروپشتی، چاپخانەی دارثقافة، بەغدا،٢٠٠٧.

٢٥- مستەفا نەریمان، شۆڕشی برایم خانی دەلۆ١٩٢٠، چاپی دووەم، کەرکوك،٢٠٠٧.

٢٦- ناهیدە رەفیق حلمی، بەسەرهاتی رەفیق حلمی، پێداچوونەوەی کەژاڵ ئەحمەد، بەشی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی. ٢٠٠٥.

**چوارەم / کتێب بە عەرەبی**

٢٧- سروة اسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦ - ١٩٣٩ دراسة تاريخية سياسية، مطبعة حمدی، السليمانية.٢٠٠٦.

٢٨- سهيل خورشيد عزيز، صفحات من تاريخ مدينة كفری،مطبعة تةما، السليمانية،٢٠٠٢.

٢٩- عبدالستار طاهر شريف (د)،الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية فى نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، طبعة الاولى، مطبعة المعرفة للنشر والتوزيع، بغداد،١٩٨٩.

٣٠- كاظم حبيب (د)، لمحات من نظال حركة التحرر الوطنى للشعب الكردى فى كردستان العراق، طبعة الثانية، مطبعة اراس، اربيل،٢٠٠٥.

٣١- مسعود البارزانى، البارزانى والحركه التحرريه الكرديه ثورة بارزان ١٩٤٥-١٩٥٨،كردستان،١٩٨٧.

٣٢- مسعود البارزانى، البارزانى والحركه التحرريه الكرديه ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥،الجزء الثالث، مطبعة وقزارة التربية، اربيل،٢٠٠٢.

٣٣- مصطفى نريمان، ما اسداة الاكراد الى المكتبة الاكراد الى المكتبة العربية، مطبعة حسام، بغداد، ١٩٨٣.

## پێنجەم / گۆڤار

٣٤- ئازاد هیدایەت دەلۆ، مژدەیەك بۆکوردستان،((ڕەنگین)) گۆڤار، بەغدا، ژ(١٢٠)،١٩٩٩.

٣٥- عومەر عەلی شەریف: مستەفا نەریمان چەند بیرەوەریەکی کەرکوك، ((نەوشەفەق)) گۆڤار، کەرکوك، ژ(٢)،ئایاری ٢٠٠٣.

٣٦- مستەفا سەید احمد،اوازێك لەنەوجوانێکەوە،((گەلاوێژ))گۆڤار، بەغدا، ژمارە(١٠)ی سالّی ١٩٤٣.

٣٧- مستەفا نەریمان، سێ جار بەخزمەتی شێخ مەحمود گەیشتوم،((ڕەنگین))گۆڤار، بەغدا، ژ(١)،١٩٨٧.

٣٨- مستەفا نەریمان، کوردێکی شۆرە سوار برایم حەمەخانی گێژ،((ڕەنگین))گۆڤار، بەغدا، ژ(٥٤)،١٩٩٣.

٣٩- موکەرەم تالەبانی (د)،کۆمەڵەی دارکەرو پارتی هیوا چۆن دامەزرا،،((ڕەنگین))،گۆڤار، بەغدا، ژ(٥٢)،١٩٩٣.

٤٠- وریا صالح، ساتێك لەگەڵ کاروانی پرسەرەوەری نووسەر و میژوونووسی بەناوبانگ مستەفا نەریمان،،شەم،، گۆڤار،کفری، ژ(٤-٥)٢٠٠٢.

٤١- گۆڤاری((ڕۆشنبیری نوێ))، ژمارە(٩٤)،١٩٨٢.

٤٢- گۆڤاری((بەیان))، ژمارە(٩٢)، ت٢/١٩٨٣.

**شەشەم / ڕۆژنامە بەعەرەبی (جرائد و صحف)**

٤٣- قيس قرەداخي، في رحاب ذكرى (مصطفى نريمان)،((الناقوس)) جريدة،كفري،عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧.

٤٤- اعداد جريدة الناقوس، مصطفى نريمان وقصتة مع اول مفكرة جيب كردية،((الناقوس))جريدة، كفري، عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧.

٤٥- كريم حميد عزيز، مصطفى نريمان يروى احداث كركوك عام ١٩٥٩ بشكل تفصيلي و كشاهد عيان،((الناقوس))،عدد(٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧، ص٤.

٤٦- مصطفى احمد محمد، نريمان مناضلا ومربيا و مؤرخا،((الناقوس)) جريدة،كفري،عدد(٤٤)،٢٦/٥/٢٠٠٧.

٤٦- مكرم سيد احمد البرزنجي،مكتبه مصطفى نريمان من بغداد الى كرميان،((الناقوس))جريدة،كفري،عدد(٤)،٢٠٠٧.

**حەوتەم / دیدار**

٤٧- دیدار لەگەڵ سەید فاتیح سەید، هەولێر،٢٣/١٢/٢٠٠٩.

# کورتەیەك لەسەر
# هونەکان و مەترسی و هێرشیان بۆ سەر
# ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی

وەلی ئەنوەر وەلی

## کورتە باسێکی گشتی دەربارەی هونەکان:

هونـەکان ئـەو بیابـان گـەرە سـامناکانە بـوون[١] کـە جەرمـەنی نـەبوون و کۆچـبەری ئاسـایی بـوون[٢] و لـەو هـۆزە بەربـەر[٣]یانـە نـەبوون کـە تـرس و دڵەڕاوکێیان بۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆمانی دروست کردبوو[٤].

لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٥)ی زاینـی ئیمپراتۆرییـەتێکیان دروستکرد کـە پانایییەکەی لە باشووری ڕوسیاوە بۆ لای ڕۆژئاوا و درێژییەکەشـی لـە ناوچـەکانی نزیکی باکووری ئەورووپاوە تا دەگاتە ڕووباری دانوب[٥].

ئەمانە خاوەنی کۆمەڵێك داب و نەریت بوون لەوانە سەرکوڵمی منداڵەکانیان لە سـاڵی لەدایکبوونیانـدا داخ دەکـەن، و خۆراکیـان ڕەگـی دارو گۆشـتی نیـوە برژاوبووە، بە کوێستان و دارستانەکاندا دەگەڕان، هەر لە منالیەوە خۆیان لەسەر برسێتی و سەرما ڕادەهێنا، و شوێنی نـەگۆڕیان نـەبوو و بـێ مـاڵ و حـاڵ بـوون، ئەم نەژادە نەسرەوتە خەریکی تاڵانی و کوشت و بڕی دراوسێکانیان دەبن[٦].

لەم سەردەمەدا وا دەهاتە بەرچاو کە هونەکان بیانـەوێ هـەموو خۆرهـەڵات و خۆرئـاوای ئـەورووپا داگـیر بکـەن(٧)و توانیـان هـەرێمی دانـوبی باشـوور داگـیر

بکەن[٨] و دواتر توانیان قوتە خۆرهەڵاتیەکان و هۆزەکانی جەبید و مارکۆمانی وە سلاڤە باشووریەکان بخەنە ژێر ڕکێفیان[٩].

ئاتیلا(٤٣٣-٤٥٣زاینی)ی کوڕی مونـدزوك حـوکمی دەکـردن و ڕەمـزی ئـاینی هونەکان خەنجەرێکی بەزەویدا چەقیوە[١٠]. ئەفسانەیەك هەیە کە دەڵێت: یـەکێك لە شوانەکان خەنجەرێکی دۆزیەوە و بردی بۆ ئاتیلا کـە ئـەمیش وای زانـی ئەمـە خەنجەری خواوەندی شەڕە، و دۆزینەوەی بـەمانای ئـەو دێـت کـە ئـاتیلا جیهـان پـەلامارو داگـیر دەکـات. هـەروەها ئەفـسانەکە دەڵێـت: لـەو کاتـەوە ئـاتیلا ویستویەتی دەسەڵات بگرێتە دەست بە تەنها، بۆیە فەرمانی کردووە بە کوشتنی براکەی(بەلـدا) بەمـەش ئـاتیلا لەبەرچـاوی گەلەکـەی وەکـو خواوەنـدێکی پـیرۆز دەهاتە بەرچاو[١١].

## هێرش بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژهەڵاتی:

ئەوەبوو هونەکان لە ڕۆخی دەریـای ڕەش مانـەوە هـەتا سـاڵی(٤٢٥ز) دوایـی بەرەو(تەراقیا) ڕۆیشتن و مەترسیان بۆ سەر کۆستەنتینیە پەیـداکرد[١٢]. ئەمـەش وای لە ئیمپراتۆری بیزەنتی ڕۆژهەڵاتی(تیۆدۆسیۆسی دووەم) کرد کـە هێزەکـانی لە شەڕی لەگەڵ(وەنداله)کان بکـشێنێتەوە، و لـەم کاتـەدا ئـاتیلا دانـوبی بـڕی و تـوانی چـەندین شـار کـە دەڵـێن زیـاد لـە(٧٠) حـەفتا شـاری بڕیـوە، وە وای لـە ئیمپراتۆر کرد کە باجی ساڵانەشی بـۆ زیـاد بکـات[١٣]. و ئیمپراتـۆر واز لـە بـەری ڕاستی ڕووباری دانوب بهێنێ بۆ هونەکان[١٤].

دوای ئـەم ڕووداوانـە ئیمپراتۆریـەتی بیزەنتـی ڕۆژهـەڵاتی دەسـتی بـە پلانـی لەناوبردنی ئاتیلاکرد و توانی وەزیرێکی ئاتیلا بـە نـاوی(ئیـدکۆن) بـە لای خۆیـدا

ڕابکێشێت، بەڵام هەرزوو ئاتیلا بەمەی زانی و بە پێچەوانەی ئەوەی کە چاوەڕوان کرابوو، ئاتیلا تەنیا گلەیی لە ئیمپراتۆرکرد بەرامبەر بەو کارە[١٥].

## هێرش بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژئاوایی:

دوابەدوای زنجیرە شەڕێکی سەرکەوتوانە لە دژی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژهەڵاتی و کە دەستکەوت گەلێکی زۆری بۆ هونەکان بەدواوە بوو[١٦] ئاتیلا ڕووی کردە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژئاوایی و لەساڵی(٤٤٧ز) هێرشی کردە سەر ناوچەکانی (مواشیا، تەراقیا، ئەلیزیا، بانۆنیا)[١٧] وێرانی کردن و گرنگترین دوو ناوچە کە هێرشی بۆ سەرکردبوون بریتین لە:

### أ- هێرش بۆ سەر وڵاتی( گال ):

ئاتیلا ڕووباری ڕاینی بڕی و هێرشی کردە سەر وڵاتی (گال) لە ساڵی(٤٥١ز) بەخۆی و سوپاکەی کە بە نزیکەی (٦٠٠)هەزار کەس مەزەندە دەکران، و تاڵانیان کرد و دواتر ڕووباری(موزل) و(سین)ی بڕی و بەرەو شاری (ئۆرلیانز) ڕۆیشت و ترس و دڵەڕاوکێی لای دانیشتوانی ئەو ناوچانە دروستکرد تەنیا شاری(ترۆی) نەبێت کە ئەمەش بەهۆی هەوڵەکانی ئۆسقوف تەنیانۆس کە وەك پشتگیرو دڵدانەوەی دانیشتوان بوو[١٨] کاتێك ئاتیلا لە(ئۆرلیانز) بوو گەردەلوول و هەورێکی خۆڵاوی بینی، دانیشتوانیش وایانزانی کە خوداوەند بەدەم پاڕانەوەکەیانەوە هاتووە، و ئەمە یارمەتی خوداوەند[١٩] بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی کە هات سەرکردەی بیزەنتی(ئاتیۆس) بوو کە لەگەڵ سوپای بیزەنتی و هاوپەیمانەکانی لە قوتە ڕۆژئاواییەکان بە سەرکردایەتی(تیۆدریك)و سەکسۆنەکان و بەرجەندیەکان و فەرەنجەکان[٢٠].

لە سەرەتادا ئاتیلا کشایەوە بە هیوای ئەوەی کە گۆڕەپانێکی دیکە بۆ جەنگ بدۆزێتەوە کە زیاتر گونجاوبێت بۆ سوارچاکەکانی، ئەوەبوو لە نزیك ناوچەی(شالون) گیرسانەوە[21] ئەوەبوو سەرکردەی بیزەنتی(ئاتیۆس) ڕووبەڕوویان بووەوە[22] لە شەڕێکدا لە سالّی (٤٥١ز) بەسەر هونەکان سەربکەون، و بە بڕوای مێژوونووسان ئەو شکستەی هونەکان ڕۆژئاوای ڕزگارکرد لە مەترسی هونەکان، و ئەو شەڕە کارەساتێکی گەورەبوو کە بە گوێرەی مەزەندەی هەندێ لە مێژوونووسان نزیکەی(١٦٥)هەزار پیاو لە هەر دوولادا کوژران[23].

## ب- هێرش بۆ سەر ئیتالّیا:

دوای شکست هێنانی لە شەڕی(شالون)، ئاتیلا کشایەوە بۆ سەربازگەکەی، دواتر ئاتیلا خۆی و هێزەکەی بەرەو ئەلّمانیا گەڕانەوە لە هەمان سالّدا لە(٤٥١ز)[24].

سەرۆکی هونەکان خۆی بەدەستەوە نەدا و زۆر بە خێرایی سوپاکەی کۆکردەوەو هێرشی کردە سەر ئیتالّیا[25] لە سالّی(٤٥٢ز)[26] ئەوەبوو (ئەکویلیا)ی وێرانکردو و دانیشتوانی ئەو ناوچایەی ناچارکرد کە بەرەو نزیکی قەراغی ئاوە نزیکەکانیان بڕۆن و لەوێ شاری بوندوقیە دروست بکەن، هەروەها شاری(پادوا)ی کردە خۆڵەمێش و هەندێ شاریش ملکەچی ئاتیلا بوون لەوانە شارەکانی (ڤیرۆنا، باڤیا، میلانۆ). و لە کۆشکی میلانۆ، ئاتیلا وێنەی ئیمپراتۆری بینی کە لەسەر تەخت دانیشتووە و سەرۆکی هونەکان لە بەردەمیدا کڕنووشی بۆ بردووە، بۆیە ئاتیلا فەرمانی کرد بە وێنە کێشەکە کە سەرۆکی(هون)ەکان لەسەر تەخت دابنێت و ئیمپراتۆر لەژێر پێیدا کڕنووشی بۆ بردبێت، بۆ ئەوەی وێنەکە

زیاتر لەڕاستیەوە نزیك بێت[٢٧]، ئەوەندەی پێ نەچوو شاری(ڕۆما) مەترسی هێرشکردنە سەری لێدەکرا لە لایەن هونەکانەوە، ئەمەش وای کرد کە ئەسقوفەکەی پاپا لیۆی مەزن بەخۆی چووە پێشەوە بۆ دانوستان لەگەڵ ئاتیلا[٢٨]، و لە تالان کردنی پایتەختی ئیمپراتۆری بیزەنتی ڕۆژئاوایی، ئاتیلای پاشگەزکردەوە[٢٩]، هەروەها ئەفسانەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سێبەری قدیس پوتروس، ئاتیلای ترساندووە بۆیە پاشگەزبووەتەوە[٣٠].

لە ڕاستیدا قات و قوڕی و نەخۆشی تاعوون لە کاتی هێرشی ئاتیلادا هەموو ئیتاڵیای داگرتبوو، هونەکان لە ترسی نەخۆشی و دەست نەکەوتنی خواردەمەنی[٣١]و هەروەها ئاتیلا هەستی کرد کە سوپای بیزەنتی ڕۆژئاوایی نزیك بووەتەوە، ئەمانە هەمووی بەسەریەکەوە وایکرد کە ئاتیلا لە یۆلیۆی ساڵی ٤٥٢ز ئیتاڵیا چۆل بکات دوای ئەوەی بەڵێنی وەرگرتنی سەرانەی ساڵانەی لە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ڕۆژئاوایی، وەرگرت[٣٢] دوای چەند مانگێك ئاتیلا لە لادێ پاشاییەتیەکەی[٣٣] بانونیا[٣٤] لە نزیك دانوب لە ساڵی (٤٥٣ز) کۆچی دوایی کرد[٣٥] دوابەدوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی هونەکان لە نێوان کوڕەکانی دابەشکرا کە ژمارەیان ئێجگار زۆربوو، و لەو نێوەندەشدا شەڕو پێکدادان لەسەر بەشە میراتی ئاتیلا لە زۆر شوێن و جێگە سەریهەڵدا. بەم جۆرە خەڵکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی بندەستیش هەلەکەیان قۆستەوە و لە دژی هونەکان ڕاپەڕین[٣٦]و لەشەڕی(ندیۆ) لە ساڵی (٤٥٤ز) توانیان بەسەر ئیمپراتۆریەتی هونەکان سەربکەون و بەم شێوەیە ئیمپراتۆریەتی هونەکان ڕووخا و کۆتایی پێهات[٣٧].

## دەرئەنجام

* هونـەکان هـۆزێکی ئاسـیایی بیابانگـەربوون خـاوەنی کۆمـەڵێك داب و نـەریتی تایبەت بەخۆیان بوون.

* لە سەرەتای حوکمڕانی ئاتیلاوە هەر خەریکی پاوانکاری و هێرش بۆ سەر ئـەم ناوچەو شارو وڵات بوون.

* دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەیان گەیشتە ئەوپـەڕی ئـەوروپای ڕۆژئـاوا تەنانـەت مەترسی بۆ سەر ڕۆما پەیداکرد.

* سـەرئەنجام دوای مردنـی ئـاتیلا بـەهۆی نـاکۆکی نـاوخۆیی و بێـزاری دانیشتوانەوە، ئیمپراتۆریەتەکە ڕووخا.

**پەراوێزەکان و سەرچاوەکان:**

١- جیمس ئا.کوریك: ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی، و: رەسول سولتانی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ب.س، ل٢٧.

٢- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، و: عەلی بوداغی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ی.س، ل٢٨.

٣- بەربەر: لە ڕاستیدا لێرە بە شێوەیەکی ڕەها مەبەست لە توندوتیژی ونەفامی ئەو هۆزانە نیە، بەڵکو جۆرێك لە دواکەوتوویان پێوەدیاربوو لە لایەنی دووربوون لە ژیانی شارستانیانەوە. سعید عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠٠٩م، ص٥٥.

٤- محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠٠٦م، ص٩٠.

٥- دان ناردۆ: لاوازبوون و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم، و: ئەسکەندەر مەحمود، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ب.س، ل١٢٣.

٦- جیمس ئا.کوریك: ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، ل٢٧.

٧- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٢٨.

٨- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٣.

٩- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٠.

١٠- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٠.

١١- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٠.

١٢- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٣.

١٣- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩١.

١٤- السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية(٣٢٣-١٠٨١هـ)، دار النهضة العربية، بيروت، ب.س، ص٤٩.

١٥- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩١.

١٦- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ص٢٩.

١٧- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٣.

١٨- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢.

١٩- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢.

٢٠- دان ناردۆ: س.پ، ل١٢٣؛ محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢؛ سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٢١- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢.

٢٢- دان ناردۆ: س.پ، ل١٢٣.

٢٣- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢.

٢٤- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٢-٩٣.

٢٥- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٣٠.

٢٦- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٢٧- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٣.

٢٨- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٢٩- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٣٠.

٣٠- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٣١- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٣٠.

٣٢- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٣٣- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٤.

٣٤- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

٣٥- محمود سعيد عمران: م.س، ص٩٣.

٣٦- جیمس ئا.کوریك: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٣٠.

٣٧- سعيد عبدالفتاح عاشور: م.س، ص٧٤.

# داهاتووی دونیا لای مارکس

ئامادەکردنی قوتابی/ حسێن کریم حسن

## پێشەکی

سەدەی نۆزدەهەم ئەوەندەی پەیوەندی بە پەرەسەندنی شارستانیەت و کۆمەڵگاوە هەیە بە گشتی و دەربارەی بەرەو پێشچوونی زانستەکان،بە تایبەتی زانستە مرۆڤایەتیەکان، دەکرێ ئەم سەدەیە بە چارەنووس سازترین سەدە ناو ببەین.

لە بواری زانستە مررۆڤایتیەکان و فەلسەفەدا تیۆری ئەوتۆ بەرچاو دەکەون کە وێنەی جیهانی زانستی و فەلسەفەی کلاسیکیان سەراپا گۆڕیووە،تیۆری (ماتریالیزمی دیالێکتیکی) کارل مارکسیش کە لە هەندی کۆڕ و کۆمەڵە بە (فەلسەفەی مارکسیزم) ناو دەبرێ،هەڵویستی مرۆڤ و بەر چاو روونی بەرانبەر بە بۆچوونی باوی پەیدابوون و رەووتی بەرەو پێشچوونی مێژووی مرۆڤایەتی و تەنانەت پێشبینی کردنی بۆ داهاتووش هەڵگەراندۆتەوە.کە ئەمەش وای کرد جۆرێکی تری لێدانەوە بە رووداوە مێژوویەکان ببەخشێ.

کارل مارکس لە رێگەی دیراسە کردنی مێژووەوە توانی (ماددییەتی مێژووی) بە جۆرێك دابرێژێت کە لە خزمەت تیۆرەکەی دابێت. لێرەشدا هەر بە مێژوو وازی نەهێنا،بەڵکو کەوتە ملکەچ پێکردنی چەندین زانستی تر، وەکو زانستی کۆمەڵناسی و پشتگیری کردن لە تیۆری پەرەسەندنی داروین کە ئەمەش زیاتر لە

بەر ناوەرۆکە ئایدۆلۆژیەکەی بوو،نەوەك لە بەر زانستیەتی تیۆرەکەوە.لە دوای هەموو ئەمانەش مێژووش ئەو پاریگایە بوو مارکس و تیۆرەکەی گۆلێکی مێژووییان تیادا تۆمارکرد.

کاتێکیش باس لە راڤەی مێژوو دەکرێ ناکرێ راڤەی ماددییەتی مێژوویی بە هەند لە بەر چاو نەگیرێ،چونکە تاکو ئیستا هیچ تیۆرێك وەك (ماتریالیزمی دیالێکتیك) جێگای مشتومڕو داکۆکی لێکردن و دژاتیەتی کردن نەبووە.

هەر بۆیەش بە پێویستمان زانی کە وا توێژینەوەکەمان تایبەت بکەین بە لێکدانەوەی مێژوو لە رێگەی ئابووریەوە لە روانگەی فەلسەفەی مارکسەوە،بە تایبەت پێشبینی کردن بۆ (داهاتووی دونیا)، کە بە (کۆمۆنیزمی زانستی) ناوی بردووە.کە ئەمەش جێگای باس و هەڵوەستە کردنە لە ئاستیدا، کە دەبێ بخرێتە روو و بزانین تا چەند لە تەرازووی لۆژیك و مەنتقەوە کێشی هەیە.

سەبارەت بە ناوەرۆکی توێژینەوەکەمان پێکهاتووە لە سێ بەشی سەرەکی، کە بەشێکیش بە سەر دوو تەوەرە دابەش کراوە، لە بەشی یەکەم و لە تەوەرەی یەکەم باسمان لە ژیان و بەرهەمەکانی کارل مارکس کردووە، هەروەها پەیوەندی مارکس بە ئەنگلسی هاورێیەوە خراوەتە روو ، لە تەوەرەی دووەمیشدا باسمان لە دیالێکتیکی هیگل و و کاریگەری بەسەر مارکسەوە کردووە،وەك زەرورەتێکی لێکۆڵینەوەکەمان.

هەروە لە بەشی دووەم و لە تەوەرەی یەکەمی دا باسمان لەو یاسا بنچینەییانە کردووە کە فەلسەفەی مارکسی لە سەر بنیاد نراوە،کە( یاسای یەکە لێکدژی – یاسای چەندایەتی بۆ چۆنایەتی – نفی کردنی نفی)، وە باسمان لە (هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان) کردووە بۆ زیاتر زاڵبوون بەسەر لێکۆڵینەوەکەدا. وە هەردوو چەمکی (ژێرخان و سەرخان)ی

کۆمەڵگا خراوەتە روو،چونکە بەبێ شارەزابوون لەم یاسایا و چەمکانە زۆر ئەستەمە خوێندنەوەیەکی دروست بۆ فەلسەفەی مارکسی بکرێت بەگشتی و بەتایبەت (ماتریالیزمی مێژوویی).وە لە تەوەرەی دووەمیشدا باسمان لەو پۆلێن بەندییەی مێژوو کردووە کەوا بە بڕوای مارکس مێژووی مرۆڤایەتی بڕیویەتی لە ماوەی رابردوودا،کە ئەمانیش(کۆمۆنەی سەرەتایی –کۆیلایەتی – دەرەبەگایەتی–سەرمایەداری)وە خاسیەت و نیشانەی جیاکەرەوەی هەر قۆناغیك بە چرو پری باس کراوەو خراوەتە روو.

لە بەشی سێیەم و کۆتایش بە هەمان شێوە بەسەر دوو تەوەرە دابەش کراوە کە تەواوی ناونیشانی توێژینەوەکەی لە خۆ گرتووە.لە تەوەرەی یەکەم باس لە شۆرشی پرۆلیتاریا و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کراوە وەك مەرجێکی گەیشتن بە قۆناغی کۆتایی مێژوو.لە تەوەرەی دووەم سەرەتا باس لەو قۆناغە ناوەندیە کراوە کەوا بە قۆناغی ئامادەکاری یاخود قۆناغی گواستنەوە بۆ کۆمۆنیزمی زانستی ناودەبرێ ئەویش (قۆناغی سۆسیالیست)یە.دواتر باس لەو شێوازەی کۆتایی مێژوو کراوە کە مارکس پێشبینی دروست بوونی دەکرد و پێی وابوو شتێکی ناچاریە و مێژوو بە خۆیەوە دەیبینێ ئەگەرچی ئەزموونکرا لە سۆڤیەت و ولاتانی ئاسیادا وەك چینی میللی بەلام ئەزموونێکی هەڵەی بەخۆیەوەبینی بۆیەش بە هەڵە ناوی دەبەین ،چونکە هەموویان کۆتاییان بە داڕووخان هات.

لێکۆڵینەوەکەمان خستنە رووی تیۆرەکەی مارکس نیە بە تەنیا،بەڵکو هەوڵمان داوە بە شێوەیەکی زانستی ئەو رەخنانەش بخەینە روو کە لە تیۆرەکەی

کارل مارکس گیراوە.گرنگترین ئەو سەرچاوانەشی سوودمان لێیان بینیوە ئەمانەی خوارەوەن (مانیفێستی حزبی کۆمۆنیست) لە نووسینی (کارل مارکس

و فردریك ئـەنگلس)ە، باشـترین سەرچـاوەی توێژینەوەکەمانـە کـە توانیومانـە سوودی زۆری لێـوە دەسـتە بـەر بکەین،چـونکە ئـەم سەرچـاوەیە دەستنیـشانی هەموو لایەنـەکانی سـەرمایەداری دەکـات،وە راڤـە و شـیکردنەوەی ئـەم قۆنـاغی سـەرمایەداریەی کـردووە، بـەرای زۆربـەی بیرمەنـدان گـەورەترین بـەردە لـە سەرمایەداری گیراوە.

هـەروەها (لمحـة عـن تطـور المجتمـع منـذ بـدء التـاريخ) لـە نووسـینی (ل.سـیغال)ە.ئەمـەش یـەکێکی تـرە لـە سەرچـاوە گرنگـەکان کـە قۆنـاغ بەنـدی مێـژووی مرۆڤایـەتی بـە شـێوازێکی یـەکجار جـوان دەخاتـە بـەر دەسـت. وە پـەرتووکی (تطـور الفکـر المارکـسي) لـە نووسـینی (د.اليـاس فـرح)ە،ئەمـەش یـەکێکی تـرە لـە سەرچـاوە گرنگـەکان بـە شـێوازێکی خـستنە روو رەخنـەیی دیراسەی فیکری مارکسی کردووە،

یەکێکتر لە سەرچـاوە گرنگـەکان (المفـصل في فلـسفة التـاريخ) لـە نووسـینی (د.هاشـم يحيـى المـلاح)ە.ئەمـەش لێکۆلینەوەیـەکی فەلـسەفەی مێـژووە، لـە چوارچـێوەی ئـەو راڤـە کردنـەوە راڤـەی مادییـەتی مێـژوویی دەخاتـە روو.وە هەروەها پەرتووکی (المادية التاريخية) لە نووسینی هەردوو نووسـەری سـۆڤیەتی (کیللە ، کوفالسون)ە.یەکێکـە لـە سەرچـاوە دەگمەنـەکانی لـە سـەر کۆمـەڵگای مارکسی نووسراوە، وە پـەرتوکێکی تریش لەوانەی زۆر سوود مەنـدی کـردین (في فلسفة الحضارة) یە لە نووسینی هەردوو نووسـەر (د.أحمـد محمـود صـبحي و د. صـفاجعفـر عبدالـسلام)ە. وە کتێبـی(سـەرمایە)ش لـە نووسـینی (کـارل مارکس)ە،ئەمەش یـەکێکی تـرە لـە سەرچـاوە گرنگـەکان سـوودی باشـمان لێـی بینیووە.

بێگومان بۆ هرکارێکیش دەبێ ماندوو بوونی لە پێناویدا بچەشی، سوپاس بۆ خوا لە پەیداکردنی سەرچاوە کێشەیەکی ئەو تۆمان نەهاتۆتە رێ، بەلأم کاری وەرگێران زۆر ماندووی کردووین.بە تایبەت لە چەند سەرچاوەیەك بە زمانی فارسی،لە کۆتایشدا ئومێدیشمان وایە توێژینەوەکەمان ئاستی زانستیەکەی وای لێبکات خۆی بسەپێنێ. وە بەم توێژینەوەیە توانیبێتمان بەرچاو روونیەکمان کردبێت بۆ هەر کەسێك کە ئەم توێژینەوەیە دەخوێنێتەوە، لە کۆتایشدا دەڵێن هیچ کاریك نیە لە دونیادا کامل و بێ و کەم و کورتی نەبێت،(فلادیمێر لینین) دەڵێ(من لم یعمل لا یخطأ) واتە:ئەوەی کارنەکات ئەو هەڵە ناکات.داوای بەخشینمان هەیە لە هەر هەڵەیەك.

## تەوەرەی یەکەم: ژیان و بەرهەمەکانی کارل مارکس، پەیوەندی بە فریدریك ئەنگلس،کاریگەری هیگڵ لە سەر مارکس.

### یەکەم: کورتەیەك لە ژیانی کارل مارکس

کارل مارکس لە٥ی ئایاری ١٨١٨ز لە دایك بووە، باوکی دادوەریکی یەهودی بووە.[1]. ئەو بە ئاین جولەکە بوو بنەچەی دەگەڕایەوە سەر بنەماڵەی باوەردارانی حاخامە بە ناوبانگەکان [2].

مارکس لە شاری تریر لە ئەلمانیا لە دایك بووە و هەر لەم شارە دا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیشی لە ١٨٣٥ز تێپەڕاندوە، دواتر دەچێتە زانکۆکانی (بۆن - بەرلین)و پلەی دکتۆرای لە فەلسەفە بەدەست هێناوە[3]. دوای وەرگرتنی دکتۆراکەی لە بەر ئەوەی بۆچوونەکانی پەرگیرانە بوو رێگەی پێنادرێ وانە بڵێتەوە لە زانکۆ، بۆیە روو لە کاری رۆژنامە نووسی دەکات [4].

لـه سـاڵی ١٨٤٢ز بووەتـه سـەر نووسـەری (رۆژنامـەی رایـن)بـەڵام رۆژنامەکـە دادەخرێت لە لایـەن حکومـەتی ئـەلمانی بـە تۆمـەتی هێرشـکردنە سـەر حکومـەتی ئەلمانی،وەلە هەمان سـاڵ بۆتـە سـەر پەرشـتیاری رۆژنامـەی(بـۆ پێشەوە) دواتـر گواستراوەتەوە بۆ پاریس[٥]..هەروەها لە ساڵی١٨٤٤ز مارکس هەڵوێستی گـۆرا لـە دیموکراتی شۆرشـگێری بـۆ شـیوعی شۆرشـگێری[٦]. دوای دەست بـەکاربوونی لـە کـاری رۆژنامــە نووســی رۆژنامەکــەش دادەخــرێ، بۆیــە روو دەکاتــە پــاریس چونکە(بزووتنەوەی سۆشیالیستی) لەو شارەدا گەیشتبووە ترۆپك. لە وێدا چەندان بیرمەنـدیکی ناسـی. دواتـر هاورێیـە گیـانی بـە گیانیەکـەی دەناسـێ کـە (فریـدریك ئەنگلس)ە، کەوا هاودەم و هاو خەباتی مارکس بووە، بەڵام دواتر بـالوێزی پروسـیا (گیزۆ)ی وەزیری فرەنسا لەو وڵاتە دەریدەکات و پەنا دەباتە بەر وولاتی بـەلجیکاو لە برۆکسل ئۆقرە دەگرێ. بـە هـۆی بـەژداری کـردن لـە (شۆرشـەکانی ئـەلمانیا و فرەنسا)ی ساڵی ١٨٤٨ز دەردەکرێـت و رووەدەکاتـەوە ئـەلمانیاوە. بـەڵام لـە سـەر داوای ئەنگلسی هاورێی روو دەکاتە لەندەن تاکۆتایی تەمەنی[٧].

مارکس لە تەمەنی لاویەتیشیدا کچە سۆشیالیستێکی خۆشەویستووە بـەناوی (جینی ڤۆن ویستڤالن) دواتـر ئەلقـەی دەستگیرانیـشی لـە سـاڵی ١٨٤٣ز لەگـەڵ دەگۆرێتەوە و زەماوەندیان سازکردووە[٨].

لـە کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٨٨١ز (جینـی ڤـۆنی) خێزانـی کۆچـی دوایـی دەکات و مارکسیش دوای دوو ساڵ لـە دوای هاوسـەرەکەی لـە سـاڵی١٨٨٣زدا ژیـان جێـدێڵێت وئـەویش کۆچـی دوایـی دەکـات، لـە (گۆرسـتانی هایگیـت) لـە لەنـدەن دەنێـژرێن.لـە دوای خـۆی مـارکس سـێ کـچی جێمـاون کـچەکانی هاوسەرگیریان کردوە لەگەڵ سێ کوری اشتراکی ، کچەکانیش ئەمانەن (جینـی لۆنگوە ،ئیلیـانور أیفلنـغ ، لـۆرا لافـارغ) کـورێکی لـۆرا لافـارغ ئەنـدامی حزبـی اشتراکی فرەنسی بوو.[٩].

دووەم: بەرهەمەکانی کارل مارکس لەتەواوی مێژووی دونیادا ئەوەندەی بەرهەمی بیرمەندان و فەیلەسوفان کاریگەریان بەسەر جیهانەوە هەبووە، هیچ شتێکی تر بە قەد ئەمەوە کاریگەری دروست نەکردووە. بۆ لێکۆلینەوەش لە بارەی هەر بیریارێك دەبێ ئاماژە بە بەرهەمەکانی بکرێت، چونکە بەرهەمی بیرمەندان وەکو منداڵکانیان پێناسەیان کردووە.

ئەوەشی تایبەت بێ بە باسەکەی ئێمەوە تیشك بخەینە سەر ئەو دەست نووس و بەرهەمانەی (کارل مارکس)ە کەوا لە ماوەی ژیانی دا نووسیویەتی و کاریگەریان بەسەر جیهان درووست کردووە، وە بیر و فەلسەفەی مارکسی تێدا چر کراوەتەوە.یەکەمین شتێك کەوا کارل مارکس نووسیێتی (دەست نووسە ئابووری و فەلسەفیەکان)یەتی کەوا لە ساڵی ١٨٤٤ز بڵاوی کردۆتەوە ،دواتریش کتێبی (خێزانی پیرۆزی) نووسی و لە ساڵی١٨٤٥زبلاوکرایەوە[١٠].

دواتر بە هاوبەشی لەگەل (فریدریك ئەنگلس)ی هاورێی (ئایدۆلۆژیای ئەلمانیا)یان نووسی لە ساڵی ١٨٤٥ز–١٨٤٦ز[١١]. یەکەم کتێب لە ماوەی بە یەك گەیشتنی مارکسایەتی (بێ نەوایی فەلسەفە) بوو لە ساڵی١٨٤٧ز، دواتر مارکس لە بەلجیکا چووە نێو کۆمەلەی بانگدێری کۆمۆنیستان، دوای ناچارکردنی و دەرکردنی لە ئەلمانیاوە مارکس چووە بەلجیکا و لە ساڵی١٨٤٨زدا لەگەڵ ئەنگلس (بیان الشیوعی)، (مانیفیستی حزبی کۆمۆنیست)یان نووسی[١٢].

وە کتێبی (ململانێی چینایەتی لە فەرەنسا)لە ساڵی١٨٥٠ز وکتێبی (لویس پۆنابرد و١٨برومێر)لە سالی ١٨٥١–١٨٥٢ز نووسیووە[١٣].

هەروەها ئەونامانەشی کەوا مارکس لەگەڵ هاورێیەکانی ئالوگۆری کردووە لە شێوەی نامیلکەیەك بەناوی (بەشێك لە نامەکانی مارکس) لە ساڵی١٨٧٥ز لە لەندەن بڵاو کراوەتەوە، وە لە ساڵی ١٨٦٧زدا یەکەم بەرگی کتێبە بەناو

بانگەکەی (رأس المال) سەرمایەی بڵاوکردۆتەوە[١٤]. دواتر لە دوای خۆی بەرگی دووەمی (رأس المال) سەرمایە لە لایەن ئەنگلسی هاوڕێی لە ساڵی١٨٨٥زدا وە بەرگی سێیەمیشی لە سالی ١٨٩٤زدا بلاوکردەوە[١٥].

هەروەها چەندین نووسین و بەرهەمی تری هەیە، بەلام هەوڵمداوە ئەوەی باسیان لیوە دەکەم بە بەلگەوە بیان خەمە روو چ لە ساڵی نووسین و بلاو کردنەوەیان چ لە ناوەکانیان بە ئەمانەتەوە باسیان بکەم ئەگینا شتی تریشی هەیە وەکو ئەو کتێبەی (بۆس الفلسفە) کەوا ساڵی نووسین وبلاوکردنەی دیارنەبوو.

## سێیەم: پەیوەندی (کارل مارکس – فریدریک ئەنگلس)

لە دوای ئەوەی کارل مارکس بواری وانە ووتنەوەی پێنەدرا لە زانکۆ،وە داخستنی ڕۆژنامەی (رانیش چایتۆنگ) یش بواری بیرکردنەوە و ژیانی لە بەردەم تەسك کردەوە. بۆیە مارکس ناچار بوو ئەلمانیا جێبێڵێت. لە سالی ١٨٤٣ز ڕوودەکاتە پاریس و لەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ (فریدریك ئەنگلس ١٨٢٠-١٨٩٥ز) پەیدا دەکات و چەندین کاریان بە یەکەوەئەنجام داوە[١٦].بۆیە دەتوانین بڵێین یەکەم بەیەك گەیشتنی کارل مارکس بە فریدریك ئەنگلس لە پاریس بووە.بەلام وەك ناسین پێشتریش ناوبانگی یەکتریان بیستبوو.

لە سالی ١٨٤٤ دۆستایەتی مارکس و ئەنگلس دەستی پێکرد.فریدریك ئەنگلس (ئەوکوری پیاوێکی دەولەمەندی المانییە و خاوەنی کارگەی رستن و چنینە بەلام ئەنگلس لە بەر ئەوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کۆر و کۆمەلە روناکبیریەئەلمانییەکان هەبوو). دوای ئەوە مارکس پەیوەست بوو بەوانەوە ئەنگلس سۆشیالیستێکی شۆرشگێری لێ سازبوو،ئەنگلس نامیلکەیەکی نووسیبوو

کە بۆ ساڵنامە بوو.ئەمە کاریگەرتی لە سەر کارل ماکس دانا لە رووی ئابوورییەوە[17].

کاتێکیش ئەنگلس دەچێتە پاریس چاوی بە مارکس دەکەوێت.دەستیان بە کارێکی هاوبەش کرد کە نامیلکەیەك بوو لە ١٥ لاپەرە پێك هاتبووئەنگلس بە مارکس دا کە بە ناونیشانی (خێزانی پیرۆز)بوو پێی وابوو ئەمە دەبێتە نامیلکەیەك ئەمە لە ساڵی ١٨٤٥ بڵاو کرایەوە لە شێوەی کتێبێکی ٣٠٠لاپەرەیی.ئەمە یەکەم کتێبی مارکس بوو وەك کتێب[18]. هەروەها لە ساڵی ١٨٤٦ز دا مارکس و ئەنگلس کۆمیتەی ئالوگۆری بابەتە کۆمۆ نیستیەکانیان پێك هێنا [19]. هەر چەندە مارکس و ئەنگلس بۆچوون و ئایدیا لیستی یەکسانیان هەبوو.بەڵام ئەم بابەتە بەو مانایە نایە کە هزرەکانی ئەوان بە تەواوی یەکسان بوون[20].

چەندین نووسراو و کاری زانستیان بە یەکەوە ئەنجام داوە ئەمانە چەند نموونەیەکە لە کارەکانیان:

١-العائله المقدسه (خێزانی پیرۆز)له ساڵی (١٨٤٤-١٨٤٥ز).

٢-الایدولوجیة الالمانیة لەنێوان ساڵانی(١٨٤٥-١٨٤٦ز).

٣-البیان الشیوعی له ساڵی( ١٨٤٨ (ز) [21].

ئەنگلس وەفاداربووە بۆ مارکس تەنانەت لە دوای مردنی مارکس لە ساڵی ١٨٨٣ز ئەنگلس بەرگی دووەم و سێیەمی پەرتووکی (رأس المال)ی کارل چاپ کردووە[22].لە دوای مارکس ئەنگلس درێژەی بە کارەکانی خۆی داوە ،ئەویش خاوەنی چەندین پەرتووکی سەربەخۆیە کە بە تەنیانووسیویەتی.

## تەوەرەی دووەم: دیالێکتیکی هیگڵ و کاریگەری لە سەر کارل مارکس

### یەکەم: دیالێکـتیکی هیـگڵ

چەمکی دیالێکتیك سەرچاوەکەی (یۆنانی) یە و بە مانای (دیالۆگ یاخود گفتوگۆ یان مشتومر)دێت، دیالێکتیك بە مانا گشتیەکەی مەبەست لێی بەڵگە هێنانەوەش ناسراوە [٢٣]. تیۆری دیالیکتیك یەکێکە لە تیۆرە بەناوبانگەکانی بواری فەلسەفەی مێژوو،کە فەیلەسوفان ویستوویانە لە رێگەی دیالێکتیکەوە سەرلەبەری راڤەی مێژوو بکەن و لەوێوە بتوانن شرۆڤەی راستی مێژوو بە خوێنەرانی بگەێنن.ئەم تیورەش دەگەرێتەوە بۆ هەر یەکە لە فریدریك هیگل کە خاوەنی دیالێکتیکی نموونەیی یە و کارل مارکس خاوەنی دیالێکتیکی ماددییە.

دوو چەمك ناواخنی فەلسەفەی(فریدریك هیگل)[٢٤] (١٧٧٠-١٨٣١ز)پێك دەهێنن،ئەوانیش (دیلێکتیك=ئایدیالیزم)ن سە بارەت بە دیالیکتیی هیگل بەم جۆرەیە:هیگل دەڵێ(هەموو شتێك لە سروشت بەتایبەت هزری مرۆڤ (بەو پێیەی فەلسەفەکەی جەخت لە سەر هزر دەکاتەوە)،کە هزر لە ئاستەکەی دا کامل دەبێت و ئەویش لەرێگەی گۆشەی دیالێکتیکەوە)یە، کە بەم شێوەیە (تێز=ئانتیتێز=سەنتێز) [٢٥]. لە لای هیگل قۆناغی یەکەم بە گەرد دەست پێدەکات،وە قۆناغی دووەمی دروست بوونی گەردی نوێیە و دژی گەردی پێشوو دەوەستێ و دژایەتی نێوانیان بەردەوام دەبێت،ئینجا قۆناغی سێیەم دەست پێدەکات کە پێی دەڵێن هاوبنیاد[٢٦]، پرسی دیالێکتیك پرسێکە بەردەوام برەو بە هێزی ململانێ دەدات.ئەم ململانێیەش لە نێوان دوو هێزی دژکاری یەکتردایە،هێزی فەلسەفی و نوستالێژخواز و هێزی نوێکار و ئایندە خواز،ململانێ ی نێوان ئەم دوو هێزە لە نێو گەردوون و کۆمەڵگا و واقیعی کۆمەلایەتی دا هێزی پاڵنەری ئەنجامدانی گۆرانە لە سەرجەم ئاست ولایەنەکانەوە[٢٧].

لە بەر ئەوەی لۆژیکی لێکدژی وەك چۆن لە نێو بیرو هزدا هەیە لە نێو جیهانی سروشتیشدا ئاشکرایە ،بەڵگەش بۆ ئەوە ئەمەیە:جوولەی تەنە ئاسمانیەکان و گۆرانکارییە دیاردە سروشتیەکان و ئالوگۆرەکانی کەش و هەوا هیچی لە جوولە و گۆرانی خواست و ئارەزووە مرۆییەکان و گۆرانی دیاردە دەروونیەکان و ئالو گۆری مەزاجە کەسییەکان کەم لێکدژتر نیە[٢٨]

بەڵام دواتر بۆچوونی زانستیانەی دیالێکتنیك دەیسەلمێنێت کەوا ماددە بنەچەی بوونە و بیریش رەنگدانەوەی ماددەیە مێژووش بزوێنەری بیرە،بەم چەشنە بیری زانستیانەی دیالێکتیك لە باوەشی ئایدیالیزم رزگاری دەبێت و هەر ئەم رزگاربوونەش رێی لە بەر دەم توێژینەوەی زانستیانەی کۆمەڵ خۆش کرد،کە لە هەموو کەم و کوری و بۆچوونێکی ئایدیالیانە دەرباز بێت و جۆرە بیردۆزێکی نوێش دەربارەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بهێنێتە ژیانی لە دایك بوونەوە کە ئەویش ماتریالیزمی مێژووییە[٢٩] .

## دووەم: کاریگەری دیالیکتیکی هیگڵ لە سەر کارل مارکس

لە زۆربەی سەرچاوەکان دا جەخت لە سەر ئەوە دەکرێتەوە کەوا مارکس لە ژێر کاریگەری هیگل دابووە، بەتایبەت لە دیالێکتیکدا،وە خۆشی ئەوە بە ئاشکرا رادەگەێنێ کە ئەو خۆی بە قوتابی هیگل دەزانێت. ئەوەتا هەر خۆی دەڵێ(کاتێ خەریکی نووسینی بەشی یەکەمی سەرمایە بووم،نەوەی نوێ ئەو بانگەشە کارە ملهورو هیچ وپوچانە ، شانازیان بەوە دەکرد گوایە ئەوان وەکو(سەگێکی تۆپیوو دەروانننە هیگڵ)،بۆیە دەستپێشخەریم کرد و بە ئاشکرا رامگەیاند،من هیچ نیم تەنیا قوتابیکی ئەو بیریارە مەزنە نەبێت[٣٠] .

ئەمە ئەو قسەیە کە مارکس بە ئاشکرا رایدەگەیێنێ،کە خۆی بە قوتابی هیگڵ دەزانێ، ئایا لە کرداریە فەلسەفیەکەشی وایە.بەڵێ لە بارەی دیالێتیکی هیگل لە پێشووتر باسمان کرد کە دیالێکتیک لای هیگڵ لە(جەوهەر=دژایەتی=هاوبنیاد)پێك دێت.دیالێکتیکی مارکس هەمان دیالێکتیکی هیگڵە، بەڵام بە شێوەی پێچەوانە،ئەمەش وتەکەی خۆی ئەمە پشت راست دەکاتەوە کە ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێ (هیگڵ مرۆڤایەتی بە رێگا رۆیشتن لە سەر سەر ئاگادارکردەوە، دەبێ مرۆڤایەتی سەر لە نوێ بێتەوە سەر پێ)[31].مانای وایە هیگڵ مرۆڤایەتی بە فکر ئاگادار کردەوە کە لە کاسەی سەردایە،بەلام کاتێ مارکس دەڵێ خستمەوە سەر قاچ واتە قاچەکان ئەندامی ماددین.

سەبارەت بە فەلسەفەی هیگل زیاتر بە گەشەی ئەقل و ئایداکانەوە سەرقاڵ بوو، کە ئەمەش فەلسەفەیکی ئایدیالیستیانە بوو. گەشەی سروشت و مرۆڤ و پەیوەندییە

کۆمەلایەتی یە سەرکەوتووەکانی مرۆڤی لە بەرەو پێشچوونی ئەقڵدا دەبینی[32]. گەرچی دواتر مارکس بە شێوازێکی تر لە هیگڵ وفەلسەفەکەی دەروانێت . ئەوەتا لە کتێبی سەرمایەدا مارکس جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە دەڵێ ( باوەری من وایە کە پێچەوانەیە لەگەڵ هیگڵ، جوولەی هزر شتێك نیە لە رەنگدانەوەی ماددە زیاتر لەسەر زهنی مرۆڤ کە تەنیا نیشاندەری بیرە،واتە مارکس باوەری بە ماددە و سروشت و بوونی راستی بابەتیانە هەیە کە لە دەرەوەی هۆشی مرۆڤدا سەربەخۆیە. پێی وایە ماددە لە پلەی یەکەمە،چونکە سەرچاوەی هەست و بیرە، وەئیلهام بەخشی هۆشە، وە لە پلەی دووەم بیرە کە بەرهەمی ماددەیە پێکەوە گرێدراون پێکەوە گرێدرانێکی پتەو[33].

بێجگە لەمانە مارکس چەند چەمکێکی دیکەی وەك (لە خۆ بێئاگابوون) و (یەکێتی لۆژیك و دیالێکتیك و مەعریفە) و(چەمکی ئازادی وەك پێویستێکی دەرك پێکراو) و(پێناسەی یاساو یاسامەندی مرۆڤایەتی) و(چەمکی لە بەریەك راوەستانی نێوان سامان وهەژاری لە سەرمایەداری) (نامەکانی و پێویستی خەباتی رزگاری خوازانەی نەتەوەکانی کۆلۆنی)،وە (پێناسەی هونەر ودابەشبوونی) لە فەلسەفەی هیگل وەرگرتووە[٣٤]

کەواتە بە گشتی هیگل کاریگەری زۆریشی بە سەر مارکسەوە هەبووە، بەلآم سوود وەرگرتنی مارکس لە هیگل زیاتر لە دیالێکتیکەکەیدا بە دیدەکرێت .هەرچەندە مارکس دوای ئەوەی بوو بە خاوەنی بنچینەیەك و فەلسەفەیەکی جێگیری خۆی ئەوا دەبینین هەر خۆیەتی دەڵێ(رێچکەیەکم بەتەنیا جیاواز نیە لە رێچکەی هیگل، بەڵکو پێچەوانەشیەتی)[٣٥]. تەنانەت لینینیش باس لەوە دەکات کە وا پەرتووکی سەرمایە بریتی یە لە مەزهەبی هیگڵ لە پێشوەچوونی دژایەتی و دووانەیی[٣٦]. واتە مارکس سوودی لەو دژایتییەوە وەرگرتووە کە هیگڵ پەی پێبردووە لە بواری هزری، بەلآم مارکس لە بواری مادی دا بە کاری هێناوە.

## بەشی دووەم

## تەوەرەی یەکەم: یاسا بنچینەییەکانی دیالێکتیك،هێزەکانی بەرهەمهێنان وپەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان، ،ژێرخان و سەرخان

### یەکەم: یاسای یەکە لێکدژەکان وململانێی نیوانیان

ئەم یاسایە لە سەر ئەوە بنیاد نراوە کەوا هەموو شتێك وەستاوە لە بەرامبەر دژەکەیدا،وەکو (سالیب و موجەب،رەق و شل، گەرم و سارد....هتد) ئەم ململانیەش بەردەوام دەبێ لەگەڵ دژەکەی وە بە هۆیانەوە پێشکەوتن درووست دەبێت.

مارکس دەڵێ(دژایەتی و ململانێ لە نێوان هەموو یەکەکانی سروشت و بیر ورێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کلتوری ....هتد دا هەیە ،ئەم رکابەریەش نیشانەی پێشوەچوونە وەکو ئەوەی نوێ دژایەتی کۆن دەکات، بەمجۆرە بەردەوام دەبێ دەرەنجامەکەی هەر پێشوەچوونە جا لە هەربواریکدا کە لە نێوان هەر دوو دژێك روویدات [٣٧]هەروەها لە لایەنی کۆمەڵایەتیش دا بە روونی دیارە کەوا سەرمایەدار و کریکار ئەمانەش دژی یەکتر دەوەستن لە سەرەتای رژێمەکەوە بەردەوام ئەمانە لە ململانێ دان، ئەنجامەکەشی بەرەو پێشکەوتن ئاراستەیان دەکات، لە کۆتایدا مێژوو لە بەردەم ناچاری دا خۆی دەبینێتەوە کە دواتر لە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریادا ئەنجامەکەی دەستگیردەبێ و دواتریش دەچێتە قۆناغی هاوبەشی (شیوعی) [٣٨].

ئەگەرچی مارکس وای دەبینێ کەوا هەموو شتێك لە سروشتدا دژی هەیە و لە نێو خۆیدا دژایەتی دروست دەبێ و لە ململانێ دادەبن تاکوئەنجام یەکێکیان ئەویتر لە نێو خۆیدا وون دەکات: بەلأم ئەگەر بێت و سەیری سروشت بکەین ئەوا

وەکو یەکەیەکی پێکەوە بەستراو دێتە پێش چاو و لێکنەپچراون وە لە کاتی دژایەتی دا شتەکان لێك دوور دەکەونەوە نەك بە گژ یەکتر دابچن، وەئەگەر سەیری پێکهاتەی جەستەی مرۆڤیش بکەین بە هەمان شیوە ئەندامەکانی پێکەوەگرێدراون و لێك جیا نین بە دژایتیشیان لیکترازان و لێك دوور کەوتنەوە روو دەدات و لە کورتی دەدات.

## دووەم: یاسای گواستنەوە لە چەندایەتییەوە بۆ گۆرانی چۆنایەتی

ئەم یاسایە بریتی یە لەوەی کەوا هەر شتێك لە سروشتدا چەندایەتییەکەی زیاد یاخود کەم بکرێتەوە ئەوا چۆنایەتییەکەکەی گۆرانی بەسەر دادێت،وەکو ئەوەی گۆرانکاری لە پلەی گەرمی ئاودا بکرێت،چەند پلە گەرمی زیاد یاخود کەم بکرێتەوە بەم ئەندازەیە گۆران لە چۆنایەتییەکەی روودەدات.

مارکس پێی وایە ئەم گۆرانە بەم شێوە روودەدات گۆرانکاریە چەندایەتیەکان کەلەکەدەبن وە ئینجا گۆرانکاری لە چۆنایەتی روودەدات[39]. وە نموونە دەهێنێتەوە بەوەی لە ژیانی کۆمەلآیەتیشدا کۆمەڵگا لە گۆران و گواستنەوە دایە لە قۆناغێك بۆ قۆناغێکی تر، ئەمەش بەم شێوەیە روو دەدات، یەکەم جار گۆرانە لە چەندایەتیەوە دواتر کاریگەری دروست دەکات، بۆ ئەوەی لەم قۆناغە بیگوازێتەوە و چۆنایەتیەکەی بگۆرێ[40]

بۆ نموونە کاتێك بمانەوێ بەرلە رووبارێك بگرین و ئاوەکەی گلبدەینەوە ئەوا هەڵدەستین سەرەتا چەند بەردێکی تێدەخەین دەبینین گۆرانکارییەك روودەدات،بەلآم گۆرانێکی کەمە بەسەر چۆنایەتی رووبارەکە داهاتووە،دواتر ژمارەی بەردەکان زیاد دەکەین دەبینین چەند ژمارەی بەردەکان زیادبکەین ئەوا

چۆنایەتیەکەی گۆڕانی بە سەر دادێت.تاکو لە کۆتایی دادەتوانین گۆڕانکاری تەواو لە چۆنیەتیەکەی بکەین و بەری پێبگرین.

## سێ یەم: یاسای نەرێکردنی نەرێ.

ئەم یاسایە ئاراستەی گشتی بەرەو پێش چوون لە جیهانی ماددیدا ئاشکرا دەکات، مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە زنجیرەیەك نەرێکردن پێکدێت،بە جۆرێك سیستەمە نوێیەکان سیستەمە کۆنەکان وەلاوە دەنێن،نموونە کۆمەڵگای کۆیلایەتی شوێنی رژێمی کۆمۆنەی سەرەتایی گرتۆتەوە،وە دەرەبەگایتی کۆیلایەتی رامالّی و کۆمەگەی سەرمایەداریش شوێنی بە دەرەبەگایەتی لەق کرد،بۆیە لە دوایشدا کۆمەڵگای سۆسیالیستی شوێنی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەگرێتەوە[٤١].

بەلاّم هەروەکو مارکس ئاماژەی بۆدەکات ئەم نەفیکردنە بە شێوەی نەفیکردنێکی تەواو نییە،بەڵکو نەفیکردنێکە لە سەر بنچینەی پێشوو بنیادێکی تر دروست دەکاتەوە [٤٢]، نەرێکردن بەو مانایە نایەت کە نوێ بەتەواوی کۆن رابماڵێت، بەڵکو واقیع چاکترین شتەکانی سیستەمی کۆن دەپارێزێت و تێکەڵ بە شتە نوێیەکانی دەکات و بەرەو سەرێی دەبات.بەرەو پێشچوونیش بریتی یە لە بەردەوام زالبوونی نوێ بە سەر کۆندا و نوێش هەمیشە بوار دەدات کە رێژەی پەرەسەندن و پێشوەچوون بەردەوام زیاد بکات،ئەمەیش لە هەڵکشان و بەرەو پێشچوونی کۆمەڵگەدا بەرجەستە دەبێ[٤٣].

بۆ نموونە ئەگەر سەیربکەین دەنکە گەنمێك کاتێك دەچێنرێت ئەوا نەفی دەبێت، بەلاّم چەندین دەنکە گەنمی نوێ بەرهەم دێنێت.لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا نوێ کۆن نەفی دەکات، بەلاّم نوێ لە سەر بنچینەی کۆنەکە بناغەی خۆی دادەمەزرێنێت، واتە تەواوی یاساکە لە سەر ئەم نموونەیە جێ بەجێدەبێت.

## چوارەم: هێزەکانی بەرهـەمهێنـان

هێزەکانی بەرهەمهێنان بریتین لەو هێزانەی کەوا لە پێکهاتنی بەرهەمهێناندا نەخش و رۆڵی کاریگەر و بنەرەتیان هەیە و نیشاندەری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشت نیشاندەدات[٤٤].

هۆیەکانی بەرهەمهێنانیش چەند بەشێکن وەکو:

١-ئەو شتانە دەگرێتەوە کەوا ماددیین و کاری لە سەر دەکرێ وەکو (زەوی-سامانەکانی ناو سروشت-دار و درەخت -رووبار.....هتد).

٢-ئەو شتانەی مرۆڤ بە نیازی کارتێکردن و سەر لە نوێ دروستکردنەوەی سروشت بۆ قازانجی مرۆڤ و کۆمەڵگا دایان دەهێنێ،پێیان دەوترێ #ئامێرەکانی کارکرد ن).

٣-مرۆڤیش هێزێکە لە رێگەی هێزی بیر و هێزی جەستەی دا رۆڵی خۆی هەیە، چونکە بەبێ مرۆڤ هۆیەکانی بەرهەمهێنان بە مردوویی و بێ جوولە دەمێنێتەوە،مرۆڤ و رەنجی مرۆڤیش بە نرخترین سامانی سەر زەوین[٤٥]

هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە مرۆڤ نەیتوانیوە دەستبەرداری سادەترین ئامێر ببێ،پێ بە پێ بە هۆی عەقلیەتی مرۆڤەوە، وە بە هۆی زیادبوونی پێداویستی ئامێریش پێشکەوتنی بە خۆوە بینیووە، کە ئیستا کرداری بەرهەمهێنان بە بێ ئامێر هەر ناچێ بە رێووە.

## پێنجەم: پەیوەندیـیەکانی بەرهەمـهێنان

پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان نیشاندەری ئەو پەیوەندییانەیە کە مرۆڤ لە رەوتی بەرهەمهێناندا لەگەڵ یەکتر هەیەتی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان چۆنیەتی چین و لایەنەکانی کۆمەڵ و چوارچێوەی خاوەنداریەتی،واتە ئەوەی کە کێ خاوەن ئامرازی بەرهەمهێنانە دیاری دەکات[٤٦].

ئەو پەیوەندیانەش زۆر ئالۆزن و جۆراو جۆر و تێکەڵ و پێکەڵن، هەم ئابوورین،هەم سیاسین،هەم مەعنوین،بۆیە لێکۆڵینەوە لە سەر پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان پێویستی بە سەرنجێکی وورد و تایبەتی هەیە[٤٧].لە بەر ئەوەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان یەکێکە لە پایە هەرە گرنگەکانی بەرهەمهێنان،هۆیەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ئەم دوو لایەنە پێکەوە لکاون و لێك جودا نابن و هەر ئەم یەکێتیەشیان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چۆن خەڵکی خێر و بێری ماددی بەرهەم دێنن[٤٨].

کورتە و ناوەرۆکی باسی بەرهەم هێنان بریتی یە لەو کارتێکردنەی لە لایەن هێزەکانی بەرهەمهێنان لە هۆیەکانی بەرهەمهێنان،کاتێکیش ئەو پەیوەندییەی لە نێوانیان دروستدەبێت پێی دەوترێت پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان.

## شەشەم: ژێر خان

لە تەواوی رژێمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی خەڵکیدا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان رۆڵێکی سەرەکیان هەیە کە ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، ئەم ژێرخانە بنچینەیەکە کەوا بروای کۆمەڵایەتی و دامەزراوە سیاسی و مافپەروەری و رۆشنبیری و دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی کەی لە سەر دامەزراوە[٤٩].

ژێر خان بە واتایەکی تر هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کەوا ماددین، وە ئەو شتە ماددییانەش کاریگەرییان هەیە لە سەر لایەنی مەعنوی، کە دواتر بە سەر خان ناوی دەبەین، چونکە ژێرخان و سەرخان دوو شتی پێکەوە بەستراون، بە نەبوونی یەکێکیان ئەویتریان نابێت، واتە ژێرخان سەرخان درووستدەکات کاتێك ژێرخان نەبێت ئەوا سەرخانیش بوونی نابێت.

## حەوتەم: ســەرخـــان

ئەمەشیان بریتی یە لە وەی کـە هـەر پێکهاتەیـەکی کۆمەڵایـەتی — ئـابووری ژێرخانی تایبەتی خۆی هەیە، سەرخان لە سەر بنچینەی ئەم کۆمەڵە پەیوەندییە ئابووریانە دامەزراوە[٥٠]. واتە هەرچی هـزرە کۆمەڵایـەتی و دامـەزراوە سیاسـی و یاسـایی و رۆشـنبیری و تێکـرای دامـەزراوە کۆمەڵایەتیـەکانی دیکـەی لـە سـەر دامـەزراوە[٥١]. کاتێـك ژێرخـانی هـەر کۆمەڵگایـەك گـۆڕانی بـە سـەر دابێـت ئـەوا سەرخانیش گۆڕانی بە سەر دادێت، وە لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ژێرخانە کۆنەکاندا ســەرخانی پێـشووش وك سیـستەمێکی باڵادەسـتی بـیر و راو دامــەزراوەکانی کۆمەڵگای کۆن نامێنێ، بەڵام هەندێك لە رەگەزەکانی سەرخان تەمەنیان زۆر لەو ژێرخانە درێژتر دەبێ کە بەرهەمیان هێناوە و هاتوونە سەر سەرخانی کۆمـەڵگای نوێ. ئەمەش لـە هونـەر و فەلـسەفە و رەوشـتدا دەنـوێنێ[٥٢]. ئـەو گۆرانـەی بـە سەریان دادێت زیاتر کار لـە ژێرخـان دەکـات، چـونکە گـۆران لـە بـواری ماددیـدا ئاسانترە وەك لە لایەنی مەعنەوی.

هەشتەم: ئەو رەخنانەی لە بارەی دیالێکتیکی مارکس گیراوە

مارکس دەبێ بەر لە هەموو شـتێك ئـەو رەخنەیـەی ئاراسـتە بکـرێ کـە تاکـە هۆکـاری بـەرەو پێشـچوونی مێـژوو تـەنیا و تـەنیا لـە ئـابووری دەبینێـت، ئەمـە هەڵەیەکی گەورەیە کە وا بۆ روودانی هەر شتێك تاکە هۆکارێك بکەی بـە بەڵگـە، چونکە هیچ شتێك نییە لە دونیادا بە تەنیا هۆکارێك ئاراستەی بکات[٥٣].

هەروەها سەرەرای ئەوەی ئابووری بە هۆکاری سەرەکی دەزانێت.هۆکـارە کۆمەڵایەتیەکان و دەروونیەکان و سیاسیەکان و جوگرافی و ئایینی بـە هۆکـاری پاشکۆش نازانێ.کەچی لە هەندێ کاتدا ئـابووری هـەر رۆڵـی نیـە، ئەمـەش لـەوە سەرچـاوەی گرتـووە کـە مـارکس دەڵـێ (هــەڵو مــەرجی کۆمەڵایــەتی خــەڵك

هۆشیارییان دیاری دەكات)، بەلام ئەمە ڕاست نییە ،بەڵكو فیكر سەرچاوەی رابوون و ڕێنیسانسە نەك ئەو واقیعەی كۆمەڵگای تێدا دەژی تیۆریاكان و و ئایدۆلۆژیەكان و سیستەمە سیاسیەكان جگە لە كۆمەڵە بیرو بۆچونێك كە رەنگە لە بیرۆكەیەكی گشتگیرەوە سەرچاوەیان گرتبێت شتێكی تر نییە[٥٤].

سەبارەت بە ململانێی چینایەتیش ماركس دۆزەرەوەی ئەم فكرەیە نییە، بڵكو ئەمە لە لایەن هەندێ مێژوو نووسی فەرەنسی بە كارهاتووە بۆ لێكدانەوەی شۆرشی فەرەنسی.بۆیە ماركسیش هاتووە ئەو فكرەیەی بەكار هێناوە لەگەڵ مادییەتی دیالێكتیك گونجاندوویەتی، بۆیە بیرمەندان پێیان وایە دیالێكتیك بە بێ زانستی سوسیۆلۆژیا ماتریالیزمی مێژوویی درۆیەكی گەورە دەبوو[٥٥].چونكە ماركس كەوتە ملكەچ پێكردنی چەندین زانستی وەكو كۆمەڵناسی و پشتگیری كردن لە تیۆری پەرەسەندنی داروین كە ئەمەش لە بەر ناوەرۆكە ئایدۆلۆژیەكەی بوو نەك لە بەر ناوەڕۆكە زانستیەكەی. شتێكی تریش ئەو ئامرازی بەرهەم هێنانەی لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەكار دەهێنرێت، هەمان ئەو ئامێر و ئامرازانە بوون كە لە یەكێتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی دا كاریان پێدەكرا. سەرەرای ئەوەش بەكارهێنانی لە یەكێتی سۆڤیەتدا ناچاری نەكرد بەوەی دەبێت سەرمایەداری بێت،كەواتە شێوازی بەرهەم هێنان بە هۆی ئامرازەكانەوە بەو شێوە جەبریە نیە كە مرۆڤ ئیفلیج بكات و ملكەچی دەسەڵاتی خۆی بكات[٥٦].

## تــەوەرەی دووەم: قــۆناغــەکــانی مێژوو و خاسیەتەکــانــیان:

### یــەکــەم: کۆمۆنەی ســەرەتایــی

تەواوی مێژوونووس و شوێنەوارناسان کۆکن لە سـەر ئـەوەی کـەوا یەکـەم قۆناغی ژیانی مرۆڤ کۆمۆنەی سەرەتایی بووە، چونکە بەر لەم قۆناغـە تـا ئێستا شتێکی وا لە بەردەست دا نییـە ئەمـە بـە هەڵـە بخاتـەوە، وە یەکـەم پێکهاتـەی کۆمەڵایەتی و ئابووری یە کە لە رژێمەکانی دوای خـۆی جیـاوازترە و بـە چـەندین سیفات و نیشانەوە دەناسرێتەوە.

لەم قۆناغەدا مرۆڤ بـیرو بۆچـوونەکانی زۆر سـادە و سـاکار بـووە، تەنانـەت وەکو مارکس دەڵـێ(لـە سـەرەتای مێـژووی مرۆڤایـەتی دا مرۆڤـەکان بیریـان لـە خواردن و خواردنەوە و نیشتە جێبوون کردۆتـەوە بـەر لـەوەی بـیر لـە زانـست و زانیاری و فەلسەفە و ئایین بکەنەوە،واتە مرۆڤ سەرەتا بیری لە شتە ماددییـەکان کردۆتەوە) [٥٧].

هــەروەها ئەمــە قۆناغێکــە تیایــدا ئامرازەکــانی کــارکردن زۆر ســادەن وەك(تەپشوو،چەقۆی بەردی ،کێرد،کەوان،تیر،پاچ ....هتـد)وە پەیوەندییـەکانی بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی سەرەتایی لاواز بووە، بە هۆی سادەیی لە هێزەکانی بەرهـەمهێنان [٥٨]. دژایـەتی وململانێـی چـینایتی لـەم قۆناغـە بـوونی نـەبووە، چونکە گۆرانکاری لە بەرهەمهێناندا نەبووە، ئەم بیرۆکەیەکە هەروەکو مارکس لە مانیفیـستدا دەڵـێ(دژایــەتی لەئــەنجامی بــەرەو پێشــچوونی بەرهــەمهێنان ســەرهەڵدەدات)[٥٩].کۆمۆنـەی سـەرەتایی سیـستەمی کۆمەلایـەتی دایـك سـالاری بووە،چـونکە ئـافرەت هەڵـسورێنەری کۆمـەڵگا بـووە ، خێـزان بـە شـێوەیەکی

دیاریکراو وجێگیر نەبووە، بۆیە مندالەکان دوای گەورە بوونیان باوکەکانیان نەدەناسییەوە[٦٠]

لە کۆتاییەکانی ئەم قۆناغەدا هێزەکانی بەرهەمهێنان گۆرانیان بە سەر داهات بە شێوەیەکی پلەبەندی،بە مانایکی تر گۆران لە ئامرازەکانی لە بەرد دروستکراو بوو بۆ ئامرازەکانی لە کانزا دروست کراو،لێرەدا بە هۆی بەرەو پێشچوون لە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بەرهەمیش پێشکەوت بۆیە ئالوگۆری لە نێو هۆزە سەرەتاییەکان سەریهەلدا.

لەم قۆناغەدا لە کۆتاییەکانی دا خێزان دروست بوو بە شێوەیەکی ئابووری جێگیر، راوکردن گۆرا بۆ کشتوکالکردن و پیاویش بووە هەلسورێنەری کۆمەلگا و دایك سالاری گۆرا بۆ باوك سالاری.وە لەکۆتاییدا بیرۆکەی خاوەنداری پەیدابوو بۆیە لەسەر خاوەنداری شەر و ئاشووب دروست بوو،بۆیە جا لێرەدا لە شەرەکان هەندێکیان کاتێ شکستیان هێنا لە لایەن بە هێزەکانەوە بە دیل گیران و کران بە کۆیلە، بۆیە سیستەمی ئابووری بازی هاوێشت بۆ قۆناغێکی تر کە قۆناغی کۆیلایەتی یە[٦١]

## دووەم: کۆیلایەتی

ئەم رژێمە لە دوای پێشەوە چوونی رژێمی کۆمۆنەی سەرەتایی سەری هەلداوە،کۆیلایەتیش بە مانای ئەوە دێت کە کەسی کۆیلە خاوەنی ئیرادە و جەستەی خۆی نییە و ناتوانێت بریار لە سەر شێوەی ژیان و ئاییندەی خۆی بدات، هاوکات خاوەنی هیچ کەلو پەل و سەرمایەکیش نی یە.[٦٢]

ئەم قۆناغەش چەند نیشانەیەکی جیاکەرەوەی هەیە لە قۆناغی پێش خۆی کە هێزەکانی بەرهەمهێنان ئامرازەکانی کە لە دار و بەرد دروستکرابوون

بوونیان نەماوە، بەڵکو ئامرازەکان لە کانزا درووستدەکران وەك (گاسن ،داس) کە بەهۆیانەوە بەرهەمی کشتوکاڵی زیادی کردووە، وە کار دابەشکردن و تایبەتمەندی لە بەرهەمهێنان بە دیار کەوت.(٦٣) ، مارکس ئاماژەی بەوە کردووە لەم قۆناغەدا دووچینی سەرەکی بوونیان هەبووە،کەوا چینی یەکەم چینی دەسەڵاتدار و ئازادە، و چینی دووەم چینی کۆیلە و ژێر دەستەن،بەمەش کۆیلەکان لەم قۆناغەدا وەکو کەلو پەل مامەلەیان پێ دەکرا و ژیانیان تەنیا لە خزمەتی خاوەنەکانیان دابووە،بەمەش کەمترین مافیان هەبووە لە کۆمەڵگا (٦٤) ،ململانێ لە کۆمەڵگاکانی کۆندا بە پلەی یەکەم لە نێوان قەرزار و خاوەن قەرز بوو، لە رۆمادا کۆتایی هات بە هۆی کەوتنە ژێر باری قەرزوە گۆران بۆ کۆیلە.(٦٥)

بە هۆی ئەم رژێمەوە کۆمەڵگا رووی لە پاشەکشێ کرد،چونکە ئەم رژێمە کارەساتی بە سەر پێشکەوتنی کۆمەلآیەتی دا هێنا،لە بەر ئەوەی دەسەلآتداران بە مشە خۆری لە سەر کاری کۆیلە کان دەژیان(٦٦). لێرەشدا کاتێ کەوا کۆیلە هیچی پێنەدرا ئەوا بایەخیان بە کارەکانیان نەدەدا،هەر لە بەر ئەوە لایەنی ئابووری کۆمەڵگا لە کورتی داو دواکەوت و توشی دارمان بوو.

بۆ رزگاربوونیش لەم بارە نالەبارە و پێشخستنی لایەنی ئابووری وهۆیەکانی بەرهەمهێنان تەنیا لەرێگەی شۆرشی کۆیلەکان دەهاتە دی،ئەو ئیستغلال کردنەی کۆیلەکان هەلگەرانەوەی سەرسەختی لێکەوتەوە بە سەرکردایەتی سبارتاکۆس لە سالّی ٧٣-٧١پ.ز(٦٧).لە کۆتاییەکانی ئەم رژێمەشدا کۆمەڵگا پێشوازی لە رژێمێکی تر کرد کە دەرەبەگایەتیە.

## سێ یەم: دەرەبـەگایەتـی

لـە رێگـەی داگیرکردنـی ئیمپراتۆریـەتی رۆمـان لـە لایـەن بەربەریەکانـەوە سەریهەڵداوە،وە یاسا سەربازییەکانی هۆزە جەرمەنیکان بووە هۆی گەشـەکردنی فیودالی ئەم هێزە لە سەر بنەمای کۆمەڵ بوون وەستاوەبەڵام چینی بەرهەم هـێن کۆیلـە نـین ، بـەڵکو جوتیـارن[٦٨]. واتـە کۆمـەڵگا بەسەردووچـین دابـەش بـووە جووتیار و دەرەبەگ، جوتیارەکان موڵکی خاوەن زەوی بوون بۆیـە کاتێك کـەوا زەویەکـە لـە لایـەن خـاوەن زەوییەکـە دەفرۆشـرا ئـەوا کۆیلەکانیـشی لەگـەل دەفرۆشت[٦٩].

بەرهـەمی جوتیـارە بـچووکەکان و پیـشەوەرەئازادەکان بنـچینەی بەرهـەمی رژێمی ئابووری دەرەبەگی بوو،وە بەرهەمهێنان بە پلـە یـەك بەرهـەمی سروشـتی بووە،جوتیـاران بـە دوو شـێوە بـە دەربـەگ دەبەسـترانەوە،یەکەم جوتیـار ناچاردەکرا چەند رۆژێك لە هەفتەدا بۆ دەرەبەگ کاربکات بکات،دوووەم دەبوایە جوتیـار بەشـێك لـە بەرهـەمی زەویەکـەی واز لێبهێنـێ بـۆ گـەورەکان واتـە دەرەبەگـەکان[٧٠].مـارکس ئامـاژەی تـەواوی بـەوە کـردووە کـە ئـەورووپا لـە سـەدەکانی ناوەراسـت کـەوتبووە ژێـر کاریگـەری ئـەم سیـستەمە،وە لەگـەڵ دۆزینەوەی جوگرافیەکانیش ئەم قۆناغە زیاتر لە کۆتاییـەکانی نزیـك دەبـووەوە، بەمەش فیودالـەکان هـەموو توانایـەکیان خستە گـەر بـۆ قـۆرخکردنی بەرهـەمی کشتوکاڵی و ئەو بازرگانیانەی کە بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی تێدەپەری.[٧١]

بۆیـە جوتیارەکـان دەیانناڵانـد بـە هـۆی ئـەو استـغلالکردنەی لـە لایـەن دەرەبەگەکان لە دژیان دەکرا،بـەڵام کـەمتر بـوو لـە رژێمـی کۆیلایـەتی بۆیـە بـە شێوەی بزووتنەوە و راپەرین و هەڵگەرانەوە لە چەندین شـوێن روویـدا نموونـەش وەکـو انگلـترا و فەرەنـسا لـە سـەدەی ١٤ز ،وە لـە ئـەلمانیا لـە سـەدەی

١٦ز،هەروەها لە رووسیا لە هەردوو سەدەی ١٧،١٨ز،وەلە چین لە سەدەی ١٩زدا. [٧٢]

ئەم ململانێیەش بووە هۆی ئەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری بازێکی تر بهاوێ وبچێتە قۆناغێکی تر،چونکە هەموو رژێمەکان هۆکار گەلێك هەن کەوا دەکەن قۆناغەکە جێبهێڵێت و بچێتە قۆناغێکی تری پێشکەوتوو یان لە خۆی خوارتر،لە بەر ئەوەی هەر قۆناغەی چەند نیشانەو سیفەتی دیاریکراوی هەیە کاتێك ئەم سیفەتانەی تیا نەما بەرەو قۆناغێکی تر ئۆغر دەکات.

بۆیە لە هەناوی رژێمی دەرەبەگایەتی شێوازێی نوێتر لە بەرهەمهێنان هاتە نێو ململانێ لەگەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی کۆن،کە ئەویش سەرمایداری و بازاری ئازادبوو، کە ئەمەش بووە هۆی پێکدادان لە نێوانیان لە ئەنجامدا بوورجوازیەت توانی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ[٧٣] لێرەشدا ژیان پێشوازی لە رژێمێکی تر کرد کە رژێمی سەرمایەدارییە.

## چوارەم: سەرمایەداری

سەرمایەداری پێشکەوتووترین قۆناغە کە مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆی بینیووە،لە رووی بە کارخستنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی بەرهەمهێنان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو لایەنە باشانەشی ئاسەواری خراپیشی ناوەتەوە، وە هێزی بزوێنەری ئەم قۆناغە بریتی یە لە(زێدە بەها) [٧٤]، مارکس دەڵێ (بورجوازیەت لە ناخی کۆمەڵی فەوتاوی فیودالی سەریهەڵداوە، بەڵام ناکۆکی چینایتی لە ناو نەبردووە،بەڵکو چەند چینی تازەی کۆمەڵایەتی و هەلومەرجی نوێ ی چەوسانەوەی زەق و زۆر شێوەی نوێ ی ناوەتە جێگای ئەوانی کۆن) [٧٥].

وە کۆمەڵگا لەم قۆناغەدا بە سەر دووچینی سەرەکی دابەش دەبێت،ئەو دوو چینەش کە وەکو ئەنجامێکی ئەو گۆرانانەی بە سەر کۆمەڵگا داهاتوون ،پەیدابوون بریتی بوون لە چینی سەرمایەداران و چینی کرێکاران[٧٦]. مارکس بە چاوی رەخنەیی سەیری ئەم رژێمە دەکات و رەخنەی زۆری ئاراستە کردووە، ئەوەتا لە مانیفێستی حزبی کۆمۆنیسدا دەڵێ (بورجوازی کەرامەتی ئینسانی کردووە بە شتێکی قابیلی کرین وفرۆشتن، وە لە جیاتی ئازادی و مافی بە دەست هاتووی حاشا هەڵنەگر مافی ئازادی بازرگانی داناوە)، وە دیسان دەڵێ (بورجوازی رێز و شکۆمەندی لە ئینسان داماڵیووە،چونکە ئەوانەی وەکو(دکتۆر و قازی و پیاوانی ئایینی)کە بە پیرۆز سەیر دەکران لەم سیستەمە دا بوون بە کرێکاری کرێگرتەی بورجوازی) [٧٧] .

## پێنجەم: ئەو رەخنانەی لە پۆلێن بەندی مێژوویی گیراون

مارکس هۆشداری داوە سیستەمی سەرمایەداری کەوا ئەم رژێمە لە سەر دەستی چینی کرێکارەوە لە ناو دەچێ، چونکە مارکس پێی وایە ئەم سیستەمە هەر لە ناو خۆیدا هۆکارەکانی رووخان بۆ خۆی درووست دەکات، بەوەی دژی بەرژەوەندی چینی کرێکار کاردەکات کاتێکیش ئەم دژایەتییە لە سیستەمی سەرمایەداری گەیشتە لوتکە ئەوا کۆمەڵگا بە هۆی ئەو یاسا سروشتیەوە ناچار دەبێ پێبنێتە قۆناغێکی تر کە بە هۆی شۆرشی چینی کرێکارەوە سەردەمێکی تر دەست پێدەکات کە قۆناغی کۆتایی ژیانە ئەویش سۆسیالیزمە وەك قۆناغێکی گواستنەوە بۆ کۆمۆنیستی[٧٨].

سەبارەت بە پۆلێنکردنی قۆناغەکانی مێژووش ئەمە تایبەت نییە بە مارکسەوە، بەڵکو لە پێش مارکسیش باس لەم پۆلێن بەندییەی مێژوو

کراوە،بەلام بەشێوەیەکی وا نەبووە کەوا مارکس هاتووە ئەو هێزانەی دیاریکردووە کە وا ئەم قۆناغانە ئاراستەدەکەن.وە هۆکاری گۆرانیان لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بە ئابوورییەوە گرێدەدات.

ئەم پۆلێن بەندیەی مارکس تووشی چەندین رەخنە بۆتەوە ،چونکە مارکس هاتووە سەراپای مێژووی مرۆڤایەتی بە چەند بەلگەیەکی مێژوویی بەلگە دار و سەراپا گیر دەکات، کە ئەمەش جێگای هەلوەستەکردنە لە ئاستیدا.مارکس نموونە لە شێوازی کۆیلایەتی بە یۆنان و رۆمان دەهێنێتەوە دەلێ لە وێ سەری هەلداوە، بەلام لە شوێنەکانی تر ئەم رژێمە سەری هەلنەدابوو، دەرەبەگایەتیش لە یۆنان و رۆمان سەری هەلنەدا، بەلکو لە نێو هۆزە جەرمەنیەکان سەریهەلداوە، سەرمایەداریش لە بریتانیا سەریهەلدا نەك لە یۆنان و رۆمان.کەواتە ئەوەی مارکس کە بە گشتگیری بە سەر مێژووی دونیای سەپاندووە شایانی رەخنە لێگرتنە[٧٩] .

ئاخر هەر لە نێو بەلگەکانی مارکسەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا هەندێ شوێن هەیە تاکو ئێستا رژێمی کۆیلایەتی بە خۆی نەدیووە، هەیانە هەر نازانێ دەرەبەگایەتی چییە و هەشیانە هەر لە قۆناغی کۆمۆنەی سەرەتاییدایە[٨٠].

## بەشی سیٚ یەم

## تەوەرەی یەکەم: شۆڕشی پرۆلیتاریا و دیکتاتۆریەتیپرۆلیتاریا

### یەکەم: شۆڕشی پرۆلیتاریا

پرۆلیتاریا وشەیەکی وەرگیراوە لە زمانی لاتینی، وە لە یاساکانی رۆمانیکۆنیش بە نزمترین چینی کۆمەڵگا دەوترا، کە ئەمانە هیچ سوودێکیان بۆ دەوڵەت نەبوو تەنیا لە وەچە خستنەوە نەبێت.بەڵام پرۆلیتاریای نویٚ بریتی یە لەو چینە زەحمەتکێشەی لە کۆمەڵگای سەرمایەداری هاوچەرخدا بوونی هەیە، کە لە پرۆلیتاریای کۆن ناچیٚ تەنیا لە وە نەبیٚ کە هەردووکیان خاوەنی هیچ شتێك نین[٨١].

مارکس دەیووت کە کۆمەڵگای سەرمایەداری بە توندی دەبێتە شتێکی جەمسەری و دابەش دەبێت بۆ دوو جەمسەر، یەکەم جەمسەرێك کە پێکهاتووە لە خەڵکانێکی چەوساوە(بەهرەبراو) و جەمسەرەکەی تر پێك هاتووە لە خەڵکانێکی کەم و چەوسێنەر(بەهرەکێش).پرۆلیتاریا بە وەدەستهێنانی هۆشیاری و سوود وەرگرتن لەو هەلو مەرجەی کە هەڵی رێکخستن و یەکگرتنی ئەوی فەراهەم کردووە، سەرنجام دێتە ناو مەیدانەکەوە و بە گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری، کۆتایی بە تەمەنی سیستەمی سەرمایەداری دەهێنیٚ[٨٢].
گەشەسەندنی پرۆلیتاریا و خزانی بۆ ناو سیاسەتیش لەوە گرد دەبێتەوە،بورژوازی هەمیشە لە شەرێکی بەردەوام دایە لەگەڵ ئەشرافەکان و دووەم لەگەڵ بورژوازەکانی کە قازانجیان لەگەڵ بورجوازی نایەتەوە، وە پرۆلیتاریاش لە لایەن دەوڵەتانی هاو شێوە داوای یارمەتیان لێدەکریٚ بەم جۆرە یەکەم قالب گرتنی سیاسی پرۆلیتاریا دەست پێدەکات[٨٣].بەلام مارکس لەوە

نـەیپێکاوە کـەوا پێـشبینی کـردووە، شۆرشـی پرۆلیتاریـا لـە دوای قۆنـاغی سەرمایداری روودەدات، ئەگەربوونی شۆرش حەتمیە بەڵام بە پێی پێویستی جا لـە هـەر سـەردەمێك دابێت،نموونـە لـە یـەکێتی سـۆڤیەت و چـینی میللـی بـە پێچەوانەی بیرۆکەی مارکس شۆرش روویـدا[٨٤]. شۆرشـی پرۆلیتاریـا بـۆ ئەوەیـە کـەوا دەسـەلآت لـە دەسـتی سـەرمایەداری دەربهێنـیّ و بیداتـە دەسـتی چـینی زۆرینە، مارکس لە مانیفێستی حزبـی کۆمۆنیـستدا دەڵـیّ(کرێکـاران نیـشتمانیان نیە،ئێمە ناتوانین شتێکیان لێبسەنین کە هەر نەیان بووە، بۆیە دەبیّ پرۆلیتاریـا بـە سـەرکردەیی سیاسـی بگـات،دەبیّ خـۆی بگەێنێتـە جێگـای چـینی رێبـەری میللەت،دەبیّ خۆی بکاتە دەستیاری میللەت،چونکە هێشتا بە شێوەیەکی میللی یـە)[٨٥]. چـەندین فاکتـەریش هەیـە کـەوا دەبێتـە هـۆی روودانـی ئـەم شۆرشـە و رووخانی رژێمی سەرمایەداری کە ئەمانە چەند نموونەیەکن:

١-یەکێك لەو هۆیانە (یاسای زێدەبایی)یـە کـە دەبێتـە مایـەی چەوسانەوەی زیاتری کرێکاران، لەگەڵ یاسای کەڵەکەبوونی سەرمایە و کۆبوونەوەی لەدەستی چەند کەسێکدا، وا دەکات بەرە بەرە چینی ناوەراسـت و بەرهـەمهێن و بازرگانـە بچووکەکان ببن بە کرێکار، بـەم جـۆرە زۆربـەی زۆری خـەڵك دەبـن بـە کرێکـار و ئەمەش دەبێتە مایەی زۆربوونی خستنە رووی هێـزی کـار لـە بازارەکـانی کـاردا، سەرەنجام دەبێتە مایەی قوڵبوونەوەی کێشەی بێکـاری و دابـەزینی هەقدەسـتی کارکردن.

٢- شۆرشـی پیـشە سـازی کـە لـە پرۆسـەی بەرهەمهێنانـدا ئـامێری هێنایـە شوێنی کرێکاران و سەرمایەشی لە دەستی کۆمەڵە سـەرمایەدارێکدا کـۆکردەوەو پرۆژە بچووکەکانی لە ناو بـرد کێـشەی بیکـاری زیـاتر کـرد.بەمـەش بـازاری کـار

لەشکرێك بێکار بە خۆوە دەبینێت، کە بە دەربرینی مارکس ئەوانە دەبنە سوپای یەدەگی پیشەسازی[٨٦].

٣–زۆربەی بیرمەندانی فەلسەفەی ماددی پێیان وایە مانیفێستی حزبی کۆمۆنیست گەورەترین بەردە لە سەرمایەداری گیراوە.بۆیە مارکس دەڵێ(تاکە شتێك کەوا بورجوازیەتی لە سەر لۆمە دەکرێ ئەوە نییە پرۆلیتاریای بەرهەم هێناوە،بەڵکو ئەوەیە پرۆلیتاریای شۆرشگێری بەرهەم هێناوە)[٨٧].لە بەر ئەوەی سەرمایەداری شێوازێکی نێو دەوڵەتیە،بۆیە دەبێ کرێکارانیش شێوازێکی نێو دەوڵەتی وەربگرێت. ،بۆیە مارکس هەوڵی دەدا زووبە زوو رێکخراوی کرێکاران بکاتە یەکەمین رێکخراوی کرێکاری نێو دەوڵەتی. هەروەها مارکس بڕوای بە توندوو تیژی هەبوو بۆچارەسەر کردنی ململانێی چینایەتی[٨٨].

ئەوەتا مارکس دەڵێ( لە ناوبردنی سیستەمی سەرمایەداری تەنیا لە رێگەی توند و تیژی دەبێ،چونکە رێگەی ئاشتی رێگەیەکی دوور و درێژە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن)[٨٩]. هەر لە بەر ئەوەبوو مارکس پێی وابوو سەرمایەداری هەر وا بە ئاسانی لە بەرامبەر هەڵمەتی رێکخراوی کرێکاران چۆك دانادات و پەنا بۆ هەموو چەکێك دەبات بۆ ئەوەی بەر بە هێزی کار بگرێت، بە تایبەتی چەکی نەتەوایەتی کە بورجوازییەت وەك ئامرازێك بە کاریدەهێنێت بۆ ئەوەی نەهێڵێت کرێکارانی جیهان خۆیان لە رێکخراوێکی جیهانی رێکبخەن[٩٠].بەڵام مارکس لە مانیفێست دا دەڵێ (کرێکارانی جیهان لەم نێوەندەدا لە زنجیرەکانیان زیاتر هیچی تر لە دەست نادەن، بەڵام جیهانێك بە دەست دەهێنن،(کرێکارانی جیهان یەکگرن)[٩١].

ئــەم جــۆرە یەکگرتنــە لەکۆتاییــدا دەبێتــە جەوهــەری شــۆرش دژی سەرمایەداری، بۆیە بەر لە هەموو شتێك دەبێ پرۆلیتاریا ریزەکانی رێك بخات تاکو بتوانێ سەرکەوتن مسۆگەر بکات.ئەمەش ئامادەسازیەکە بۆ چوونە نێو سیستەمی سۆسیالیستی یەوە.کەوا قۆناغێکی گواستنەوە دەبێ لە نێوان سەرمایەداری و (کۆمۆنیزم) شیوعی.

## دووەم: دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا

بیرۆکەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا سەرچاوەکەی لە فەلسەفەی مارکسییەوەیە کە گەورەترین باوەری کۆمۆنیستی زانستییە.ئەمەش کاتێك درووست دەبێت کەوا لە کۆمەلگای سەرمایەداری دژایەتی بوونی هەبێ،کە وا دەکات شۆرشی پرۆلیتاریا رووبدات،مارکس و ئەنگلس لە مانیفێستی حزبی کۆمۆنیستدا نووسیویانە(هەنگاوی یەکەم لە شۆرشی پرۆلیتاریا ئەوەیە کەوا چینی کرێکار بگۆرێ بە چینێکی ئاسایی و بتوانێ بەرامبەر دیموکراتی بوەستێ) [٩٢].

مارکس پێی وایە ئەو دژایەتیە وا لە کۆمەلگا دەکات بە ناچاری لایەنگری لایەنێك بن و بەژداری کۆدەتای کرێکاری بکەن، دەشلێ گومانی تێدا نی یە قۆناغی کۆتایش قۆناغێکی گۆرانە بە هۆی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاوە،وە پێویستە ئەو چینەی کرێکاران بە شێوەیەکی بەرنامە رێژ و ریکخراو بن،وە لەو کرێکارانەی لە ناوچە پیشەسازیکان نیشتە جێن [٩٣].

لینین لێکۆلینەوەی لە سەر پێکهاتەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کردوە و بە شێوەیەکی تایبەتی دەلێ (هاوپەیمانیەتیەکە لە نێوان چینی کرێکارو جوتیاران و دەستەیەك لە وانەی سەرکردایەتیان دەکەن کە سەر بە چینی کرێکارانن) [٩٤].

ئەم بیرۆکەیە لە مانیفێستی حزبی کۆمۆنیست وەرگیراوە بە گشتی،دواتر شوێنی خۆی وەرگرت و جێبەجێکراو گەشەی سەند، وە مارکس سودی لە ئەزموونی شۆرشی چینی گەورەی سەدەی ١٩ز لە ١٨٤٨ ز و کۆمۆنەی پاریس لە ١٨٧١ز وەرگرت، بنچینەی بیردۆزەکەی لە شۆرشی ١٨٤٨ز وەرگرتووە،وە دەڵێ( پرۆلیتاریا ناتوانێ دەست بە سەر دەسەلاتی دەوڵەتی بورجوازی دابگرێ بەم شێوازە،بەڵکو دەبێ پەنا بباتە بەر دیکتاترۆیەت بۆ لە ناو بردنی دام و دەزگای دەوڵەتی بورجوازی)[٩٥]. پرۆلیتاریا پاش وەلانانی دەسەلاتی سەرمایەداران وەکو حکومەتێکی کاتی چینایەتی خۆی سەقامگیر دەکات ئەم حکومەتە ناودەبرێت بە ( دیکتاتۆریەتی پرۆلیتایا)بەلام نابێ سەبارەت بە زاراوەی دیکتاتۆری تووشی هەڵەبین، مەبەستی مارکس لە دیکتاتۆریەتی ئەوەیە حکومەت لە قۆناغێکی کاتییدا بە هەموو شیبۆەیەك لە دەستی پرۆلیتاریا دایە وە مارکس هەموو جۆرە حکومەتێکی چینایەتی بە جۆرێك لە حکومەتی دیکتاتۆری دەبینێت[٩٦].

هەر بۆیەش ئایدۆلۆژیستە بورجوازییەکان شیوعیەکان بەوە تۆمەت بار دەکەن کەوا دەڵێن باوەریان بە توود وتیژییە،وشۆرشی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاش بە شتێکی پێویست دەزانن و لایەنگری توند وتیژین، ئەم تۆمەتبارکردنە ئەگەرچی لە ناوەرۆکدا هەڵە نیە .

بەلام شیوعیەکان لە بنچینەدا لەگەڵ توند وتیژی دانین وە پێیان وایە ئەمە شتێکی بێ بەها وبێ مانایە، بەلام ئەوەی گرنگ بێت لێرەوەیە کە دەلێن مادام چینایەتی و دەوڵەتی چینایەتی لە سەر توند و تیژی دامەزراوە،کە دەوڵەت خۆی پێکهاتەیەکی توند و تیژییە.وە ئەم بابەتە لەوە چر دەبێتەوە کام توند و تیژی بە سەر ئەو دەولەتی چینایەتیانە سەر دەکەوێت؛ کام توندوو تیژی ئەمە جێبەجێ دەکات،توند و تیژی کۆنەپەرست یا توندو تیژی شۆرشگێری[٩٧].

## تـــەوەرەی دووەم: سۆسـیالیزم،کـۆمۆنیزم،رەخـنەکـان

### یـەکـەم: سـۆسـیالیزم

بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی پێویستە قۆناغێکی ناوەنجی و راگوزار لە نێوان (سیستەمی سەرمایەداری و کۆمەڵگای کۆمۆنیستی) تێپەڕێنین. ئەم قۆناغە بە قۆناغی سۆسیالیز لە ناو دەبرێت.سۆسیالیزم بە لابردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری لە شۆرشێکداو بە رابەری پرۆلیتایا سەقامگیر دەبێت[٩٨] .

بە گوتەی لینین سۆسیالیزم نەوەی رژێمی سەرمایەدارییە و قۆناغی کۆمۆنیزمیش رۆڵەی نەوەی سەرمایەدارییە[٩٩].لەم رژێمەدا خاوەنداریەتی گشتی ئامرازی بەرهەم هێنان وەك (زەوی- سەرمایە- تەکنەلۆژیا)و زۆر شتی تر بنەمای ئەم رژێمەیە،لەم رژێمەدا بەرژەوەندی کۆمەڵ لە سەرووی هەموو بەرژەوەندیەکانی دیکەیە،چەوسانەوەی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤ لەم رژێمەدا کۆتایی پێدێت.دەوڵەت نوێنەری چینی پرۆلیتاریا،جوتیار و روناکبیرانە[١٠٠].مارکس کرداری بەشکردنی داهاتی بەرهەمی لەو درووشمەوە هەڵێنجاوە کە دەڵێ (هەموو مرۆڤێك پێویستە کاربکات بە پێی تواناکەی، وە هەموو مرۆڤێك بە پێی کارەکەی پاداشت وەردەگرێت) [١٠١] .سەرکەوتنی کۆمەڵگای ئیشتراکی لە بە جێهێنانی ئەو ئامانجانە، واتە سەرکەوتن لە وەرگرتنی کۆمەڵگای شیوعی لە ئەنجامی نەمانی ململانێ ی چینایەتی درووست بوو لە سەر یاسای دژایەتی ؛ وە بەوە دەگەینە کۆتایی مێژوو بە پێی بیردۆزی مارکسی[١٠٢]. لە خاسیەتە دیارەکانی ئەم رژێمە ئەوەیە کەوا هەموو پرۆژەکانی وەبەرهێنان ،پیشەسازی ،کشتوکاڵ ،پێویستە سەر بە دامو دەزگای کۆمەڵ بێت، لە بەرهەمهێناندا ریکخراوی کرێکاری و هاوکاری یەکتربن. وە خاسیەتێکی

٢- پشتگیریکردنی لایەنی بەرپرس بۆ ئەوانەی توانادارن لە نووسینەوەی مێژووی کورد.

٣- دامەزراندنی دەستەیەکی (ئەکادیمیانە) لە کەسانی پسپۆڕ و چاودێریکردنی کارو نووسینەکان بکەن.

پ٢٣/ ئایا مێژوونووسانی کورد لەبەر پوخت نووسی یان لەبەر کەم کاتی کەم دەنووسن؟

و/ هەردوو لایەن ڕۆڵی هەیە.

پ٢٤/ لە هیچ نووسینێکی خۆت پەشیمانی؟

و/ نەخێر.

پ٢٥/ ئایا دراوسێکانی کورد هەر مێژووی کوردیان چەواشەکردووە یان خزمەتیشیان کردووە؟

و/ بەهۆی نووسینەوەی مێژووی کورد بە هەر شێوەیەك بێت یان بەتێکەڵ بوون بە ڕادەیەکی باش سوودمان لێ وەرگرتووە چونکە ئەگەر هەر نەنووسرابا ئەوا مێژوومان بزر دەبوو لە زۆر سەردەمدا.

پ٢٦/ چۆن وەڵامی ئەو کەسانە دەدەیتەوە کە مێژوو بەدرۆ دەزانن؟

و/ هەر ئەو کەسانەشن خۆیان شانازی بە مێژوو دەکەن.

پ٢٧/ لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانی مێژوو کامەیان بە گونجاوتر دەزانی؟

و/ مێژوو ئەو زانستەیە کە گرنگی بە ڕووداوە ڕابردووەکان دەدات و لە فەوتان ڕزگاریان دەکات بۆ نەخشەکێشان و سوودوەرگرتن لە پاشەڕۆژدا.

پ٢٨/ ئایا دایك و باوکت خوێندەوار بوون؟

و/ باوکم بەڵێ و دایکم نەخێر.

پ٢٩/ ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەی ماڵەوەت چەندە؟

و/ نزیکەی(١٠٠٠) کتێب و گۆڤار و توێژنەوەو نامەی ماستەرو دکتۆرا لە بوارە جۆربەجۆرەکاندان(مێژوو، جوگرافیا، ئەدەبی، یاسا، هونەر، وەرزش..).

# د.موکەڕەم تاڵەبانی لە بارەی عەزیز شەریف دەدوێت و چەندین نهێنی مێژوویی سیاسیی دەدرکێنێت

ئامادەکردنی: مەغدید حاجی



د.موکەڕەم تاڵەبانی وەکوو نووسەرێکی ئەکادیمی و کەسایەتییەکی سیاسی لە عێراق و کوردستان ناسراوە، خاوەن چەندین بەرهەمی دەوڵەمەندە، بەتایبەتی هەردوو بەرگی کتێبی(مراحل تطور الحركة القومية الكردية)، بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەندامی سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراق بوو. لەههمان کاتدا وەزیری ئاودێری بوو لە حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر.. ئەندامی لێژنەی باڵای ئاشتی و هاوکاری عێراق بووە. هەروەها لە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد لە بەغدا ڕۆڵی بینیوە.

لە ساڵی (١٩٦٩-١٩٧٠) هەروەها لە هەشتاکان و نەوەتەکان.. چەندین جار لە لایەن حکومەتی بەغدا، بەتایبەتی لە لایەن ئەحمە حەسەن بەکرو دواتر سەدام حوسێن ڕاسپێردراوە بۆ ئەوەی بە ئەرکی ناوبژیوانی نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو حکومەتی بەغدا هەڵسێت و جێگای متمانەو ڕێزی هەردوو لایەنیش بووە، ئەگەر کۆششەکانیشی بە ئەنجام نەگەیشتبن. بۆیە ئەم پیاوە لە نزیکەوە ئاگاداری زۆر ڕووداوو هەڵوێستی سیاسی عێراقەو لە نهێنییەکان و هۆکاری گرفتە سیاسییەکان ئاگادارە لە یادەوەریدا پارێزراون.

من وەکو توێژەرێك لە ڕۆژی دووشەممە ٢٠١٠/٣/١ لە شاری سلێمانی بە یاوەری مامۆستا خەلیل ئیبراهیم نەورۆز سەردانی د.موکەرەم تاڵەبانیم کرد لە ماڵەوەی و دیدارێکم لەگەڵدا تۆمارکرد، بە مەبەستی قسەکردن دەربارەی ڕۆڵی سیاسی و ئاشتیخوازی کەسایەتی عێراقی ناودار عەزیز شەریف، لە میانەی دیدارەکەدا د.موکەرەم ئاماژەی بۆ زۆر لایەنی سیاسی کردووە، چ ئەوەی پەیوەندی بە عەزیز شەریفەوە هەیە یان پەیوەندییان بە لایەنەکانی پرۆسەی سیاسی و ئاشتیخوازی لە عێراق و کوردستانەوە هەیە، هەندێ لە زانیاریەکانی بۆ یەکەمین جارە دەدرکێنرێن، بۆیە لەبەر گرنگی ناوەڕۆکی دیدارەکە، دەقەکەی وەکو خۆی لە گۆڤاری(مێژوو) بڵاودەکەمەوە.

* مەغدید: ناسینت بۆ عەزیز شەریف، بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟

- د.موکەرەم: من لە ساڵی(١٩٤٥)ەوە عەزیز شەریف دەناسم، کە ئەو کاتە سەرۆکی حزبی شەعب بوو. هەندێ برادەرم لە کۆلیجی ماف، لەگەڵ عەزیز شەریف بوون، بە هۆی ئەوانەوە هەندێ جار ئەچووم و ئەمبینی. لەو کاتە حزبی نەبووم، نە لە حزبی شیوعی بووم، نە لە حزبی هیوا مابوومەوە، هەروا سەربەخۆ بووم. بەهۆی کەمالی عومەر نەزمی یەك دووجار بینیومە. لەو کاتەدا ئیتجاهێکی

نازیەت لە ناو هەندێ لە قوتابییانی کۆلیجی ماف هەبوو. ڕۆژێکیان یەکێك لە مامۆستاکان داوای لە قوتابییەکان کرد لەسەر بابەتێك بنووسن، هەر بابەتێك قوتابی خۆی هەڵیبژێرێت، قوتابییەك لەسەر(سوسیالیستی نیشتمانی) نووسیبوو کە (هیتلەر) بانگەشی بۆ دەکرد. دوابەدوای ئەمە کەمال عومەر نەزمی لە ڕۆژنامەی حزبی شەعب وتارێکی بە ناونیشانی(گوگلس في كلية الحقوق) بڵاوکردەوە. لە کۆلیجی ماف لە منیان زانی، منیان دایە دادگا، منیان ڕاکێشا بۆ لێکۆڵینەوە. لەو کاتەی من هیچ پەیوەندییەکم نەبوو، نە بە حزبی شەعب نە بە ڕۆژنامەی حزبەکە، ناشزانم کێ نووسیویەتی، جا لەم ڕووداوە پەیوەندیم لەگەڵ عەزیز شەریف پەیداکرد ئەمبینی. دوایی زانیم کە کەمال عومەر نەزمی نوسیبووی. وەزیری معارف ناردیە شوێنم، پرسی لە وەڵاما وتم من هیچ پەیوەندییەکم نییە بە هینەوە، یەکێك هاتووە لە پۆلا بە ڕەزامەندی مامۆستای ئابووری سیاسی پڕوپاگەندەی بۆ نازیەت کردووە، یەکێکی تر چووە لە ڕۆژنامەیەکا نووسیویەتی، من هیچ پەیوەندییەکم بەم کێشەیە نییە، کێشەکەیان سەدکرد، ئیتر هەر ئەوەندە سەرەتای ناسینم بوو بۆ عەزیز شەریف. ئەو کاتە لە حزبی شەعب بوو، جۆرە ناکۆکییەکی قوولیش لەگەڵ حزبی شیوعی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشا جۆرە تەعاونێك لە نێوانیانا هەبوو، هەر لەو کاتەدا لە نێوان حزبی دیموکراتی و حزبی شەعب و حزبی ئیتحاد وەتەنی کە عەبدولفەتاح ئیبراهیم سەرکردایەتی دەکرد لە لایەك و حزبی شیوعی و تەحەروری وەتەنی بۆ بەعزێ جوڵانەوەی جەماوەری و خۆپیشاندان و مانگرتنی هاوکاری هەبوو. هەروەها ناکۆکیش هەبوو، هەندێ جار لە ڕۆژنامە لە دژی یەکتری ئەیان نووسی. ئەو وەختە عەزیز شەریفم ناسی.

* مەغدید: دیارە ئەو کات عەزیز شەریف ناکۆکی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق و فەهد هەبوو، هۆکارەکەی چی بوو؟

– د.موکەڕەم تاڵەبانی: من نازانم، ئەو کاتە پەیوەندیم لەگەڵ حزبی شیوعی نەبوو، بەلام ئەوەی کە لە رۆژنامەیا خوێندمەوە، مانگرتنێك ئەنجامدرا، راگەیەنرابوو کە مانگرتنێکی گشتی ئەنجام بدرێت، حزبی شیوعی لەگەڵ ئەویشا، لەگەڵ مانگرتنەکەشدا خۆپیشاندانی ئەنجامدا، کامل چادرچی و عەزیز شەریف ئەمەیان بە پێشێلکاری دانا، چونکە ئەمە لە رێککەوتنە گشتییەکەدا نەهاتبوو، کە بڕیاربوو تەنیا مانگرتن بکرێت. حزبی شیوعی وەلامی ئەدانەوەو ئەیوت: ((ئەگەر ئێمە توانای زیاترمان هەبێ بۆچی نەیکەین، ئەگەر حزبەکانی تریش لەم خۆپیشاندانەدا بەشداربوونایە شتێکی چاکتر ئەبوو))، ئیتر لەسەر ئەمە ناکۆکییان هەبوو.

حزبی شیوعی لەو کاتە عەزیز شەریف وا هینی ئەکرد کە ((نابێ حزبی شیوعی هەبێت، ئەوە حزبی شەعب هەیە ئی هەموو میللەتە))، لێرانەو لێرە بەعزێ ئەحزاب ئەیان وت حزبی شیوعی نابێ لە کوردستانا هەبێ و حزبی دیموکراتی کوردستانی تەمسیلی هەموو میللەتی کورد ئەکات، ئەو کاتە لەو وەتەرە ئەدرا.

* مەغدید: دوای داخستنی حزبی شەعب بە بڕیارێکی فەرمی حکومەت لە ساڵی ١٩٤٧ رۆژنامەکەیان(الوطن) تاکو ساڵی ١٩٤٨ بەردەوام بوو. عەزیز شەریف لە ساڵی ١٩٤٩ رێکخراوی(وحدة الشيوعيين)ی دامەزراند؛ لە کۆنفرانسی ١٩٥٦ کە حزبی شیوعی عێراق گرێیدا رێکخراوەکەی عەزیز شەریف هەڵوەشایەوەو چوونە ناو حزبی شیوعی، عەزیز شەریف بە ئەندامی یەدەگی

کۆمیتەی ناوەندی دانرا، بەڵام لەو کاتە عەزیز شەریف لە عێراق نەمابوو لە سوریا دەژیا. ئەگەر زانیاریت لەم ماوەیە دەربارەی عەزیز شەریف هەبێت؟

– د.موکەرەم تاڵەبانی: ئەو فەترەیە مەعلووماتم نییە، چونکە لەو کاتە لە بەندیخانە بووم، لە ساڵی ١٩٤٨ بۆ ماوەی حەوت ساڵ حوکمدرام و دوایی سێ ساڵیش دوورخرامەوە، ئەوەنە ئاگام لەو فەترەیە نییە.

* مەغدید: لەو کات کەسایەتی عەزیز شەریفت چۆن ناسیوە، لە ڕووی سیاسی، هزری، وەکو ڕۆژنامەنووس؟

– د.موکەرەم تاڵەبانی: تێگەیشتوو بوو، لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێگەیشتوبوو، تانەیەك نیە لەسەری، ئەو کات کە دوو سێ حزب لە وڵاتێکا هەبێ بێگومان ناکۆکی لە نێوانیاندا دەبێت، ئەگەر ناکۆکی نەبێ دەبن بە یەك حزب، هەندێ خیلافات و ئەمانە هەبوو لە بەینیانا، بەڵام وەکو کەسایەتییەك، کەسایەتییەکی سیاسی بوو، ناسراو بوو، هەر لەوە نەبوو عەزیز شەریف لە ساڵی ١٩٣٦ نائب بوو لە پەرلەمانا، لە پاش کودەتای بەکر سدقی هەڵبژێردرا. کەسایەتییەکی سیاسی ناسراو بوو. ئەو کاتە ناکۆکی لە نێوان مارکسییەکانا هەبوو. عەبدولفەتاح ئیبراهیم کەسایەتییەکی مارکسی بوو، ناکۆکی لەگەڵ حزبی شیوعیا هەبوو، عەزیز شەریف خیلافی هەبوو، عەبدوڵلا مەسعود قرینی خیلافی هەبوو، لە پاشان داوود سائغ خیلافی لەگەڵ حزبی شیوعی هەبوو، هەرچەند ئەمانە مارکسیەتییان پەسند کردبوو، بەڵام بەرەئی من هێشتا ئەم ڕۆشنبیرانە باش لە مارکسیەت نەگەیشتبوون. بیروباوەڕی مارکسیش سەرەتا لە ناو ڕۆشنبیرەکانا دەستی پێکرد، دواجار بزووتنەوەی شیوعی بووە جەماوەری و کرێکارەکان ڕۆڵیان تیا بینی و سەندیکاکان دامەزران و مانگرتن و خۆپیشاندان ئەنجام دەدران. ئەو ڕۆشنبیرانە، هەتا کامل چادرچیش بارودۆخەکەیان بە

تەواوەتی شینەکردبووەوە، هەروا رەئیان وابوو کە ئەبێ حزبی شیوعی وەکو حزبێ مەکتەبی بێ و دابنیشن و کۆبوونەوە بکەن و قسەو شت لە ڕۆژنامە بڵاوبکەنەوە، ئیتر نابێ لەوە زیاتر بێ. حزبی شەعب تەنیا یەك مانگرتنی لە ناو کرێکارانی کارگەی جگەرە ئەنجامدا، ئەو کات محەمەد سالح بەحر علوم وەکو نەقیب لە ناو کرێکارەکانا ڕۆڵی بینی. حزبی شیوعی رەخنەی لەو مانگرتنە گرت، وتی: ((نابێ ئێستا لەم بارودۆخەیا لەناو پرۆژە نیشتمانیەکانا ئەم نەوعە شتانە دروست بکرێت، هێڵی شەمەندەفەر ئەو کاتە بەدەست ئینگلیزەکان بوو، جەنەراڵێکی بەریتانی بەرێوەبەری گشتی بوو. ئەمە مینایە، ئەمە سکەکەو ئەمە نەوتە، ئەمە هینە، ئەمانە هەمووی بەدەست بەریتانیایە، ئەبێ تەرکیز بکرێتە سەر ئەو دەستگایانەی کە بەدەست ئەوانەوەیە)). وابزانم مانگرتنەکەی کارگەی جگەرە لە ساڵی ١٩٤٦ بوو.

* مەغدید: لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ عەزیز شەریف بۆتە سکرتێری گشتی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان و لە ماوەی (١٩٥٨-١٩٦٣) بەم ئەرکە هەڵساوە، لەم قۆناغە عەزیز شەریف و بزووتنەوەی ئاشتیخوازانتان چۆن بینیوە؟

- د.موکەرەم تاڵەبانی: وەڵلا بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لەو کاتەدا ڕۆڵێکی زۆر چاکی هەبوو. ئەو کاتە ببووە بزووتنەوەیەکی جەماوەری، هەتا دوو سێ کۆبوونەوەی جەماوەری گەورەی لە شارەکانی عیراقدا ئەنجامدا، وەکو بڵێی زۆرینەی میللەت لە گەلیا بوو، ئامادە ئەبوون لەو کۆبوونەوانەو موتابەعەیان ئەکردو یارمەتیان ئەدان و هینیان ئەکرد، بزووتنەوەی ئاشتیخوازان ڕۆڵی هەبوو لە کێشەی مووسڵ(١٩٥٩) بێ شك حزبی شیوعی هەستی ئەکرد کە لە موسڵ پیلانێك هەیە لە دژی حکومەت، ئەو بزووتنەوەیەی ئەنجامدا (مەبەستی لە

کۆبوونەوە جەماوەریەکەی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بوو لە موسڵ کە بەدەیان هەزار کەس تیایدا بەشداربوو م.ح) بۆ ئەوەی رێگا لە پیلانەکە بگرێت، ئەو پیلانە کاتی ئەوە نەبوو، لەو وەختەیا بتەقێ، بەڵام لە وەختێکا روویدا کە زۆر خۆیان ئامادە نەکردبوو. عەبدولکەریم قاسم و میللەت توانییان لێیان بدەن. بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لەوەیا دەوری هەبوو. بەشداربووم لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان. ئەو کاتە گەلێ کەسایەتی لەم بزووتنەوەیە بوون. لە ساڵی ١٩٦٣ موحاکەمەی من لە مەحکەمەی سەورە، باسی هینی ئەکرد، هەواڵی ئەپرسی سەرۆکی دادگا بە منی ئەوت ((ئەمە حزبێکە، جەمعیەتێکە مۆڵەتی نییە)) منیش بە گاڵتە وتم: ((جەنابتان ئیسلامن و سونیشن ئیجازەتان هەیە))! ئیتر یەك یەك ئەیپرسی ئەمانە چین، عەزیز شەریف چییە؟ ئیبراهیم ئەحمەد چییە؟ ئەو کاتە ئیبراهیم ئەحمەدیش لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بوو، فلان چییە؟ ئەمە شیوعیە؟ ئەمە هینە؟!)) بابە ئەمە شیوعی نیە، ئەمە بزووتنەوەیەکە لە پیاوی ئاین، لە سەرمایەدار، هەتا ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ جەنگ و شەڕو ئەمانە لە میللەتان دووربخەنەوە، ئەمانە بزووتنەوەی ئاشتین، شیوعیەکانی تیایە، خەڵکی تریشی تیایە.. بەڵام بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە، وانەبوو بڵێی کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی هەبێت و کۆبوونەوەی سەرکردایەتی هەبێت. ئەو کاتە من لە سەرکردایەتی نەبووم ئەو کاتە عەزیز شەریف رۆڵی دیاربوو لەم بزووتنەوەیە بەڵام پەیوەندی شەخسیم نەبوو لە گەڵیا. ئەو کاتە من فەرمانبەر بووم.

* مەغدید: ئەوەی من لە رۆژنامەو سەرچاوەکاندا خوێندبێتمەوە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز هەروەها (رێکخراوی ئاشتی و هاوکاری) لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابردوو پشتگیری لە شۆڕشەکانی ڤێتنام و فەلەستین و زۆر بزووتنەوەی نیشتمانی ولاتانی دیکە دەکرد، بەلام

ڕاستەوخۆ پشتگیری لە دۆزی کوردو چارەسەرکردنی ئاشتیانەی مەسەلەی کوردو مافە ڕەواکانی نەدەکرد؟

– د.موکەرەم تاڵەبانی: ئاخر ئەو وەختە دۆزی کورد بەو شێوەیە نەدەخرایە ڕوو، کە بزووتنەوەی کورد لە ساڵی ١٩٦١ لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم دەستی پێکرد، حزبی شیوعی و بزووتنەوەی ئاشتیخوازان و ڕێکخراوە دیموکراسییەکان ڕۆڵی گەورەیان هەبوو بۆ وەستانی شەڕ، عەبدولکەریم قاسم کە هاتە سلێمانی، لە دەربەندیخان ڕایگەیاند کە لەوەی ڕوویداوە خۆش دەبین، بێن دووبارە ئێمە وەکو برا بینەوە چی بکەین، دروشمی ئەو کات (ئاشتی بۆ کوردستان–السلم في كردستان) (٢٠) بیست هەزار ئیمزای بۆ کۆکرایەوەو پێشکەش بە عەبدولکەریم قاسم کرا. کەسایەتی لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان، لە بزووتنەوەی دیموکراسی، لە هەموو لایەکا یاداشتنامە لە پێناوی ڕاگرتنی شەڕ لە کوردستانا پێشکەش ئەکرا. تەنانەت حزبی شیوعی هەندێ خۆپیشاندانیشی بۆ ئەمەکرد.. لەو کاتەیا سێ تەوژمی سیاسی بەرامبەر حکومەت هەبوو، لایەنێك وەکو ئەڵێن ڕۆشنبیر و بۆرژوازیە عەرەبەکان بوون، هەڵوێستیان ڕوون نەبوو، بۆ نموونە محەمەد حدید لەو کاتەی کە شەڕ لە کوردستانا دەستی پێکرد ئەیوت: ((ئەمە شێوەیەکی هونەرییە بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد)). شەڕ ئەکرا ئەو ئەیگوت ئەمە: ((شکلێکی فەنیە بۆ حەل مەسەلەی کورد))!. حزبی شیوعی لەو بڕوایەدابوو ئەگەر بێت و هاوکاری هەبێ لە نێوان کوردو عەرەب فشارێکی وا دەکرێتە سەر عەبدولکەریم قاسم لە گەلێ شت پاشەکشە بکات و ڕەزامەندی لەسەر هەندێ شت بکات. ئەو کاتە پارتی و بەعزێ کەس ئەمانەش بە ئیتجاهی ئەوەبوون، لەوانە حزبی بەعس و قەومیەکان، پێیان وابوو ئەو کێشەیە تەنیا بە ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم چارەسەر دەکرێت. لەبەر ئەوە وەکو عەلی سالح

ئەلسەعدی وتی: ((ئێمە بەسواری شەمەندەفەرێکی ئەمریکی هاتینە حوکم)) فیعلا ئەمانە هەموویان پەیوەندیان لەگەڵ ئەم شەمەندەفەرە ئەمریکیە هەبووە.. هەتا لە دانیشتن مفاوەزەی نەوتا بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوت هەڕەشەی لە عەبدولکەریم قاسم کرد، کە گەیشتە رادەیەك ئیتر لەمە زیاتر بوار نەما دانوستانەکان درێژبکرێنەوە، وتی: ((بابزانین لە پاشا چی ئەبێ))؟.

عەبدولکەریم قاسم وتی: ((لە پاشا چی ئەبێ ئەمە سلسلەیەکە کۆتایی بۆ نییە، تەواو نابێ)) ئیتر دانوستان نەما، دوای نهێنی هەیە من کتێبێکم ئێستا لەژێر چاپە دەرئەچێت ئەوانەی تیا دەرئەکەوێ کە حەرەکەی کوردی پەیوەندی لەگەڵ کێشەی پیلانی ئەمریکا هەبووە لەو کاتەدا. یەکێك لەوانە فوئاد عارف و حەسەن تاڵەبانی کە وەزیر بوون لە حکومەتی ئەو کاتە، چوبوون بۆ بەیروت، سەفیری ئەمریکا ناردیە شوێنیان، قسەی لەگەڵ کردبوون و وتبویان ئێمە بڕیارمان داوە عەبدولکەریم قاسم لابەرین لە دەسەڵات، لەبەر ئەوەی ئێوە خۆتان مەبەستنەوە بەو حوکمەو ڕۆیشتنەوە دەست لە کار بکێشنەوە. فوئاد عارف گەڕایەوە دەستی لەکارکێشایەوە. بەڵام حەسەن تاڵەبانی ئایا لەبەر باش، یان لە ترسی عەبدولکەریم قاسم نەوێرا دەست لەکار بکێشێتەوە، پاشان کە کودەتا بوو، عەبدولکەریم لابرا، حەسەن تاڵەبانی لەگەڵ ئێمەیا خرایە زیندان. فوئاد عارفیش بوو بە وەزیر؟ یەکێك لەوانەیش بۆ نموونە هەندێ نهێنی تر هەیە لەو کتێبەی من بڵاودەبێتەوە، لە بەغدا دیدارێك دەبێ لە نێوان عەلی سالح سەعدی و فوئاد عارف بە واسیتەی شەوکەت ئاکرەیی، داوا ئەکا تەعاون بکەن بۆ ڕووخاندنی عەبدولکەریم، فوئاد ئەڵێ من بە تەنیا پێم ناکرێت، سالح یوسفیش ئەبێ بەشداربێ لەگەڵما، سالح یوسفیش بەشدار ئەبێ لە کۆتاییا، تاهیر یەحیاش دێ بەشدار دەبێ لەو ڕێککەوتنە، لەسەر گەلێ شت. لەسەر حکومەت

ڕێککەوتوون، ڕێکەوتوون کە حیکمەت سلێمان سەرۆك کۆمار بێت، بەهۆی ماجد مستەفا پەیوەندیان لەگەڵ حیکمەت سلێمان کردووە، موافەقەی کردووە، بەڵام کە کودەتاکە جێبەجێکرا، عەبدولسەلام ڕازی نەبوو، وتوویەتی ئێمە ئینقلابمان کرد حیکمەت سلێمان بۆچی؟ ڕێککەوتن هەبووە لە بەینی مەلا مستەفا و لە بەینی ئەوان کە حیکمەت سلێمان ببێتە سەرۆك کۆمار، حکومەتی ئیتلافی لە نێوان خۆیانا دانێن، ئەم شتانە هەیە، ئاخر ئێمە کە پشتگیری لە بزووتنەوەیەکی قەومی ئەکەین، ئەو بزووتنەوە قەومیە بە ئیتجاهی تەقەدومی دیموکراسی بێ، خۆ نەك لەگەڵ ئیستعمارا تعاون بکاو ئێمە بچین پشتگیری بکەین؟!

* مەغدید: بێینە سەر ماوەی نێوان(١٩٦٩–١٩٧٠)، عەزیز شەریف لە قاهیرە گەڕایەوە بەغدا، دەستی کرد بە وەساتەو وتووێژکرد لە نێوان حکومەتی بەغداو سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، لە ١٩٦٩/١٢/٣١ز مەرسومی کۆماری دەرچوو بە دامەزراندنی عەزیز شەریف بە وەزیری داد، لەم بارەیەوە ڕۆڵی عەزیز شەریف چۆن دەبینیت؟

– د.موکەڕەم تاڵەبانی: حزبی شیوعی ڕازی نەبوو لەوەی کە بووە وەزیر، داوای لێکرد کە ((تۆ هێشتا پەیوەندیت بە حزبەوە هەیە، چۆن بێ پرسی حزبی شیوعی ئەوەت کرد))، لە پێش کودەتای ١٩٦٨ ئەحمەد حەسەن بەکرم بینی، قسە لەسەر ئەوەکرا کە ئەوان ئامادەن حکومەت بڕوخێنن، حکومەت زۆر لاواز بوو پاڵێکی ئەوێ، پاڵێکی پێوەبنێی ئەڕوخێ، داوایکرد لەگەڵ حزبی شیوعیا هاوکاری بکەن، داواشی کرد سێ وەزیر لە حزبی شیوعی لەگەڵیانا بێ: محەمەد سلمان حەسەن، حافز توکمەچی و من: بێگومان ئێمە بەمە ڕازی نەبووین، ئەو وەختە منیش پێم ووت: ((بارودۆخی دەروونی نە بەنسبەت منەوە نە بەنسبەت

ئێوەوە ئامادە نییە، ئێستاکە ئێمە (٨٠٠)کەسی شیوعیمان لە زیندانی نوگرە سەلمان، ئێمە بێنی ببینە وەزیر لەگەڵ ئێوەیا. ئێوە کە هاتن ئەگەر توانیتان پاکتاوی ئەو کێشانە بکەن کە لە ١٩٦٣ بەرامبەر حزبی شیوعی و دیموکراتییەکانا کردووتانە، ئەو کاتە بیر لەوە ئەکرێتەوە لەسەر چ بناغەیەکدا، لەسەر چ بەرنامەیەکدا ڕێککەوتن بکرێت)). عەزیز شەریف پرسی بە حزب نەکرد چوو بووە وەزیر، بە ئەرکی وەساتە هەڵسا لە نێوان مەلا مستەفاو حکومەت، ئەو کاتە سەدام حوسێن لێی ڕازی نەبوو، کە من لە دواییا سەدامم ئەبینی ئەیووت: ((عەزیز شەریف واجهەی مەلا مستەفای بۆمان جوان دەکرد، حەقیقەتەکەی پێمان نەئەووت، کە مەلا مستەفا چی ئەکا چی ناکا، لە کاتێکا وەفدی ئەنارد بۆ بەغدا بۆ دانوستان خۆشی ئەچوو بۆ لای شای ئێران دائەنیشت لەگەڵیا قسەی ئەکرد))، ئەوە قسەی سەدام حوسێن بوو.

* مەغدید: لە ماوەی نێوان (١٩٧٣-١٩٧٤) پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەر سێ حزب: شیوعی و پارتی و بەعسی چۆن بەڕێوەدەچوو؟

- د.موکەرەم تاڵەبانی: هەفتەیەك یان دە ڕۆژ پێش ئەوەی لە ١٩٧٤ شەڕ دەست پێبکاتەوە، من و هاوڕێ عەزیز محەمەدو کەریم ئەحمەد چووینە لای مەلا مستەفا، دانیشتین لەگەڵیاو هەوڵمان لەگەڵیدا قەناعەتی پێبینین کە شەڕ نەکا، چونکە شەڕ لە بەرژەوەندیان نەبوو، ئەوسا مەسەلەی کورد لەو هینەیا نەبوو کە هەموو عالەم پشتگیری بکات، عەرەبەکان پشتگیری بکەن. ئەمانیش بەعسیەکانیش جێگای پای خۆیان قایم کردبوو. زرووفەکە یارمەتیدەر نەبوو کە کورد شەڕ بکات و لە شەڕێکا سەربکەوێت و دووبارە دانوستان لەگەڵ عێراقا

بکەن. بەڵام مەلا مستەفا وەك دوایی خۆشی لێدوانیدا ئەمریکیەکان بەڵێنیان پێدابوو. دوایی کە کاروباری خۆیان ڕێکخستن پشتیان لە کورد کردو وازیان لێهێنا. هەتا لە لێدوانێکیدا مەلا مستەفا ئەڵێ: ((بمزانیایە پرۆگرامی ئەمریکیەکان ئەمەیە من ئەمەم نەئەکرد ئەچووم لەگەڵ حکومەتی بەغدا تەفاهمم ئەکرد))، مەلا مستەفا لە دوو شتا لەگەڵ حزبی شیوعی بەینی هینی بوو، یەکێکی لە پێش ئەوەی کە جەبهە ببێت، ئەو یاداشتێکی پێشکەش بە حزبی شیوعی کرد کە ئامادەیە بەرەیان لەگەڵدا بکات و گەلێك تەنازولات و ئەمانەشی تیابوو، بەڵام حزبی شیوعی ئامانجی ئەوەبوو بەرە لە نێوان بەعس و حزبی شیوعی و پارتی بێ، بە هەموو ڕێگایەك هەوڵیدا پارتی بێتە ناو مفاوەزاتی بەرەو هەتا ڕادەیەکیش هات لە پاشا کشانەوە. هەتا لە دانیشتنێکا منیشی تیا بووم، عەبدولخالق سامەرائی سەرۆکی شاندی بەعس بوو داوای کرد ووتی: ((پارتی پەیوەندی لەگەڵ ئێرانا ببرێت)). ئێمە پێشنیازمان کرد وتمان لە کاتێکدا کە بەیاننامەی ئادار جێبەجێکراو ئۆتۆنۆمی درا پەیوەندی لەگەڵ ئێران ببڕن، ئەوان قبوڵیان کرد، بەعسیەکان وتیان باشە، محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان قسەیەکی بەناوبانگی هەیە وتی: ((من نوێنەری مەلا مستەفام لەسەرم تۆماری کەن، ئیمڕۆ فلان ڕۆژە، ئەوەندەی مانگە، هەتاکو بێ ئێمە پەیوەندیەکانمان لەگەڵ ئێرانا بەهێزتر ئەکەین))!!، عەبدولخالق سامەرائی هینەکەی داخست و ووتی: ((خۆ ئێوە ئەزانن من شۆڤینی نیم بەرامبەر بە کورد بەڵام هەرچەند ئەمە ئەبینم ئەبمە شۆڤنی))! قەزیەکەی داخست و کشانەوە لە مفاوەزات.

لە یەکێ لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاشتیا کە عەزیز شەریف تیایدا بەشداربوو، دوایی دیاربوو عەزیز شەریف خۆی ئامادەکردبوو بچێت بۆ لای مەلامستەفا. مەوعدی هەبوو هەتا بۆ نوکتە بیگێڕمەو. جانتایەکی پێبوو، جانتاکەی خستە سەر مێزەکەی من، قسەی ئەکرد، هینی ئەکرد، منیش هەر بۆ گاڵتە جانتاکەم ڕاکێشا خستمە ژێر کورسیەکەی خۆمەوە، کە تەواو بوو ئەڕۆیشت بۆ کوردستان وتی: ((کوا جانتاکەم، کوا جانتاکەم)).. وتم: ((مامۆستا نەئەوەی بۆ ئەبەی موحتاجیەتی، نە ئەوەی لێیت وەرگرتووە محتاجیەتی، ئێمە محتاجین با بۆ ئێمە بێت))!!

* مەغدید: لە سەردەمی دەسەڵاتی حزبی بەعس ڕۆڵی ئەنجومەنی ئاشتی و هاوکاری چۆن بوو کە تۆو عەزیز شەریف تیایدا کارتان دەکرد؟

– د.موکەڕەم تاڵەبانی: وەڵڵا ڕۆڵی ئەنجومەنی ئاشتی، لە دوای ئەوەی بەعسیەکان هاتنە سەر حوکم، ڕۆڵێکی شکلی بوو، ئەو بزووتنەوە جەماوەریە نەبوو کە خەڵك لەگەڵیا بێت، چونکە ئەوان خۆیان هەموو بزووتنەوەیەك، هەموو سەندیکایەك، هەموو کۆمەڵەیەك، هەرچی بێت، بەدەست خۆیانا نەبوایەو بە فەرمانی خۆیان نەجووڵابایەوە قبوڵیان نەدەکرد. ئەو کاتە هەروابوو سەبارەت بە ئەنجومەنی ئاشتی، بارەگایەك هەبوو، من بۆ ئەنجومەنی ئاشتی ئەچووم، عەزیز شەریف ئەهات، سالح یوسفی ئەهات.. جار جارە مورتەزا سەعید عەبدولباقی ئەهات، ئێ کەسێکیان نەبوو، چالاکی نەبوو، چالاکی لە دەرەوە هەبوو. بۆ نموونە کۆنگرەیەك هەبوایە شاندێکیان ئەنارد، لە ناو شاندەکانیش بەعسی ڕۆڵی ئەساسی یاری ئەکرد. بە بۆنەی(٢٠) ساڵەی بزووتنەوەی ئاشتی جیهانی لە

بەرلین کۆبوونەوەیەکی گەورە سازکرا، لە هەموو جیهانا تیایدا بەشدار بوون. لەگەڵ منا پەیوەندیان کرد (١٢)بیتاقەیان بۆ منـنارد وتیان (١٢)کەس ئەتوانی بێن بەشداری بکەن. بیتاقەکانم دایە دەست عەزیز شەریف (٥)دانەی دایە بەعسیەکان. بەعسیەکان لەوێیا خۆیان کردە هەموو شتێك لە کۆنگرەکەیا، ئەوهابوو، یانی نە عەزیز شەریف و نە یەکێکی تر ڕۆڵێکی وای نەبوو، جەماهیری نەبوو، هەر کۆبوونەوەی مەکتەبی هەبوو، عەزیز شەریف ئەڕۆیی بۆ دەرەوە لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی بەشدار دەبوو، چەند کۆنگرەیەکیش ئەنجام دراوە، ئێمەش و بەعسیەکان و پارتیەکانیش تیایاندا بەشدار دەبووین.

* مەغدید: لەو ماوەیەیَ عەزیز شەریف لە مۆسکۆ دەژیا لە دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٠ بە یەکجاری عیراقی جێهێشت، ئایا لەو ماوەیەدا سەردانی عەزیز شەریفتان کردووە، بەچی خەریك بوو؟

– د.موکەڕەم تاڵەبانی: لەو کاتەی نەخۆش بوو سەردانم کردووە لە مۆسکۆ، خەریکی نووسینی یاداشتەکانی بوو، ڕەئی خۆی لەسەر مەسەلەی کورد دەنووسی، پارچە پارچە کاغەزی ئەنووسی و بەدەمبووس لێکی ئەدا دایئەنا، چووم سەیرم کرد هەمووی دانراوە، ووتی وەڵلا ئەمەویَ لەسەر کێشەی کورد بنووسم، زۆر شتیشی نووسی بوو. تازە لە خەستەخانە دەرچووبوو هاتبووە ماڵەوە، چووم بۆ لای. ئەوەی نووسیوە چی لێهات؟ نەمبیستووە بڵاوی کردبێتەوە، کەوتبێتە دەست یەکێك.. من و هاوڕێَ عەزیز محەمەد لە مۆسکۆ سەردانمان کردووە، پیشانی داین وتی: ((ئەمانەم نووسیوە، ئیتر خەریکی نووسینم)).

شتێك هەیە با ڕوونی بکەمەوە لە مەسەلەی بەیانی ١١ ئازارا، کە بەعسییەکان هاتنە سەر حوکم مەلا مستەفا دارا تۆفیقی نارد، با من لەوەوە دەستپێبکەم، مانگێك لە پێش کودەتای ١٩٦٨ من لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکردا دانیشتم، لە جوملەی ئەو شتانەی کە لێم پرسی، ووتم: ((بەرنامەتان لە دۆزی کوردیا چییە))؟ ووتی: ((احنا متفاهمین ویاهم)) من وای لێتێگەیشتم وەکو ١٩٦٣ بەر لە کودەتا پەیوەندیان لەگەڵیانا کردووەو ئێستاش پەیوەندیان هەیە، کە پەیوەندیان نەبوو. ئەو کاتە جەماعەت مام جەلال لە بەغدا بوون. لە پاش ئەوەی کە هاتنە سەر حوکم، بێگومان ئێمە ڕازی نەبووین لەوە، هەتا وتم ئێمە وامان بۆ دەرئەکەوێ کەسی واتان لەگەڵا نییەلەو کودەتایەیا، ئەو حزبانە، ئەو کێلانە، ئەو جەماعەتانە، نەمان بیستووە کەستان لەگەڵا بێ)). ئەحمەد حەسەن بەکر وتی: ((ئێمە نەك پشت بە کەس نابەستین، بەڵام لە ڕووی ئەمنییەوە ئاشکرای ناکەین، کە کودەتاکە ڕوویدا سەیرمان کرد عەبدولڕەزاق نایف و عەبدولڕەحمان داود و ناسر ئەلعانی چی ئەمانەیان لەگەڵدایە، هەتا چوومە لای عەبدولخالق سامەرائی وتم: ((ئێمەتان لەگەڵ ئەمانەیا هێنا))؟ وتی: ((ئەمانە کاتین لا ئەبرێن))، ئیتر لابران. شەوێك دانیشتبووین لە ماڵ ئێمە عامر عەبدوڵڵاو د.مەهدی حافز، لە کۆشکی کۆماری تەلەفۆنیان بۆ کردم وتیان دەبێ بێی بۆ ئێرە، منیش چووم، تازە ناسر ئەلعانی کوژرابوو، هەتا عامر عەبدوڵلاو مەهدی ئەلحافز وتیان چاوەڕێت بکەین؟ کردمە گاڵتە وتم تا سەعات(١٠) چاوەڕێم بکەن، لەمەولا بێن لە قەنات بۆم بگەڕێن! ناسر ئەلعانیان کوشتبوو لە قەنات فڕێیان دابوو، ئیتر من چووم سەیرم کرد لە کۆبوونەوە بوون، ئەو کاتە سەعدون غێدان

سکرتێری لیژنەی کاروباری باکوور بوو، ئامر مەوقعی بەغداش بوو. وتم سەرۆك بۆ منت داواکردووە، وتی: ((تۆی پالاوتووە وەکو ئەندام لە لیژنەی بالای کاروباری باکوور)). وتم: ((وەڵلا من نایەم)) بۆ؟ خۆی تۆی پالاوتووە)). وتم: ئێمە لەسەر چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ناکۆکییەك نییە لە نێوانمانا. نەختێکی پێ چوو هاتن، لە کۆبوونەوە بوون، هەموویان هاتنە ژوورەوە، سەدام بوو، مەردان بوو، عەماش بوو، بێشك ئەحمەد حەسەن بەکریش.. ئەحمەد حەسەن بەکر هاتە لامەوە دانیشت زۆر تووڕەبوو ووتی: ((ئەمە خوا قبوڵ دەکا لەم کاتەیا ئێمە بارودۆخی ئابووریمان بەم جۆرە بێت، ڕۆژی چارەگە ملیۆن دینار بۆ ئەم شەڕو هەرایە تەرخان بکەین؟)) ئەو کات چارەگە ملیۆنێك زۆر بوو. دەستی پێکردو ووتی: ((ئەمە ئینفیسالییە))، وتم: ((لەگەڵیا ڕێك بکەون و دانوستانی لەگەڵا بکەن. بزانی چیان ئەوێ، وتی: ((ئەمە ئینفیسالییە))– واتا داوای جیابوونەوە دەکات و مەبەستی مەلا مستەفا بوو– منیش وتم من سەرم سوڕمایە مەلا مستەفا بۆ دەڵێ من داوای جیابوونەوە ناکەم. جیابوونەوە چییە؟ عەیبە عارە؟ ئێوە لە دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی ئینگلیز جیابوونەوە، چاکتان کرد.. تووڕەبوو وتی: ((چیتان دەوێ، دەتانەوێ جیاببنەوە، دەجیاببنەوە بەرۆکمان بەردەن)) منیش لە وەڵامدا وتم: ((کێ یاخەی کێی گرتووە، ئێمە یان ئێوە، دە یەخەمان بەردەن، ئێوە ڕزگارتان دەبێ و ئێمەش ڕزگارمان دەبێت))! ئیتر ساردەوەبوو وتی: ((من ئامادەم کاغەزێکی سپیت بۆ ئیمزا بکەم بیبە بۆ لای مەلا مستەفا چی ئەوێ پڕیکاتەوە من ڕازیم)) وتم: مانای ئەوەیە ڕازی نیت لەسەری، ئێوە زۆرباش ئەزانن ئەو داوای ئۆتۆنۆمی ئەکات، ئامادەی ئۆتۆنۆمی

بدەیت؟ سەدام لەو لاوە هاتە قسەو وتی: ((ئێمە زانیاریەکی وامان نیە لەسەر ئۆتۆنۆمی)) ئەحمەد حەسەن بەکر وتی: ((ئەتوانیت شتێکمان لەسەر ئۆتۆنۆمی بۆ بنووسیت)) ئێستاش یاداشتەکانم پاراستووە، چووم دوای دوو ڕۆژ بۆیم برد کە ئۆتۆنۆمی چۆن ئەبێ لە ڕووی سیاسییەوە، پێکهاتەی ئەنجومەنەکانی، ئەمانەی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتا دەبێت. وا دیاربوو لەو کاتەیا ئەوان خۆیان بۆ کۆنگرەی حزبی بەعس ئامادە دەکرد، ئەیانویست ئەو مەسەلەیە باس بکەن، بە جۆرێکی وا کە کۆنگرە ڕەزامەندی لەسەر بدات. ئەوان لە کۆنگرە موافەقەتیان لەسەر مەسەلەی ئۆتۆنۆمی کردبوو، بەڵام بەو شێوەیەی کە خۆیان باڵا دەست بن.. ئیتر مەلا مستەفا وەفدی ناردو دانیشتن و ئەمانە، مەلا مستەفا نەختێ دابەزی و گەیشتنە یەك و بەیاننامەی ١١ئازار دەرچوو. حزبی شیوعیش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە فشار دروستکردن لەسەر حکومەت، چونکە یەکەمجار حکومەت ئەیان وت ئێمە لەگەڵ جەماعەت تەقەدومی کورددا هاوکاری دەکەین لە دژی سەرکردایەتی عەشائری، (مەبەستیان لە تەقەدومی حزبی شۆڕشگێڕی کوردستانی) بوو، کە ئەو کاتە مام جەلال و حلمی شەریف و ئیبراهیم ئەحمەد بوون، لەگەڵ ئەوانا ڕێك بکەون دژی مەلا مستەفا. ئێمە پێمان وتن ئێوە کێشەتان لەگەڵ ئەمانا نییە، کێشەتان لەگەڵ مەلا مستەفاو پارتیە، ئێوە کە دانوستان ئەکەن ئەبێ لەگەڵ ئەوەیان بیکەن کە کێشەکەتان لەگەڵیایەتی، ئەوە ئەمانە لای ئێوە لێرە دانیشتوون. ئیتر ئەوەبوو کەوتنە وتوێژ، لە بەینا حزبی شیوعی دەوری هەبوو بۆ ئەوەی کە وتوێژەکان سەربکەوێت. هەتا ڕۆژێك بریماکوف ئەوەی کە لەم دواییەیا بووە سەرۆك وەزیرانی ڕوسیا، ئەو کاتە

متابەعەی وتووێژو مەسەلەی کوردی ئەکرد، هات وتی: لای کۆشکی سپی بووم شاندی کوردی خەریکە جانتاکانیان ئەخەنە ناو ئۆتۆمبیلەکە، وا دیارە وتووێژەکان سەرنەکەوتوون، ئەڕۆنەوە، ئەتوانی بڕۆی قەناعەتیان پێ بێنی کە بەشێکیان بمێننەوە، ئیتر کە نێوانیان پچڕا، ئیتر زەحمەتە کۆکردنەوەیان. چووم لەوییانە کاك مەسعودو ئەوان لەوێ بوون. وتم: بەناوی ئەوەی کە ئەچن پرس بە مەلا مستەفا ئەکەن بەشێکتان بگەڕێنەوەو بەشێکیشتان بالێرە بمێننەوە، ئەگەر مەلا مستەفا ڕەزامەندی پیشاندا لەسەر ئەوەی بەردەوام بن، ئێوە ئەگەڕێنەوە، ئەگەر نا ئەو وەختە بڕۆن، ئیتر لەوان بەشێکیان ڕۆیشتن، سالح یوسفی و نوری شاویس و یەك دوانی تریان مانەوە.وتووێژ بەردەوام بوو تا بەیانی ئازار دەرچوو.

<u>تێبینی</u>: ئەم دیدارەم لە ۲۰۱۰/۳/۱ لەگەڵ بەڕێز د.موکەرەم تاڵەبانی، سیاسەتمەدارو هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا، بۆ مەبەستی نووسینی ماستەرنامەکەم دەربارەی (عەزیز شەریف و کورد) ئەنجامداوە. بەڵام لە نووسینی نامەکەمدا لە شوێنی پێویست بە کەمی بۆچوونەکانی د.موکەرەمم خستۆتەڕوو، یان ئاماژەم بۆ کردوون. چونکە یەکێك بووە لە ناو (٤٠٠)سەرچاوە کە پشتم پێ بەستوون. لەبەر گرنگی تەواوی لێدوان و وەڵامەکانی بەڕێزیان کە هەموویم تۆمارکردووە، سەرلەنوێ دەقی دیدارەکەم پاکنووس کردەوە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لە گۆڤاری(مێژوو) لە پاکنووسکردنیشدا هەندێ وشەو دەستەواژەی د.موکەرەمم وەکو خۆی شێوەزاری گەرمیانی بەتایبەتی(کفری) هێشتۆتەوە. بۆ نموونە دەڵێ(حزب شیوعی) نەك(حزبی شیوعی). لەگەڵ ڕێزم.

# چاوپێکەوتن لەگەڵ مێژوونووس مامۆستا شوان محمدامین خۆشناو

سازدانی : پ.ی.د.محمد عبدالله کاکەسور

**-ناونیشانی نامەی ماستەرەکەت چییە؟**

ناونیشانی نامەی ماستەرەکەم هەولێر لەنێوان سالآنی ١٩٥٨-١٩٦٣ ئێستا لە ژێر رۆشنایی چاپکردن دایە و بڕیارە لە٩/٣بکەوێتە بەر دیدی خوێنەر و ئارەزوومەندانی بواری مێژوو ،هیوادارم کەلێنێك لە مێژووی کورد و کتێبخانەی کوردی پڕبکاتەوە.

**-ناونیشانی تێزی دکتۆراکەت چیە؟**

هەرچەندە ئێستا دکتۆراکەم تەواو نەکردووە ،بەلآم ناونیشانی تێزی دوکتۆراکەشم هەر درێژە پێدەری ماوەی نامەی ماستەرەکەمە، هەولێر لەنێوان سالآنی ١٩٦٣-١٩٧٠ چونکە، پێم وابوو دەکرێ شاری هەولێر زیاتر و زۆرتری لەسەر بنووسرێت و توێژینەوەی ئەکادیمی لەسەر بکرێ بەهۆی سەنگ و قورسایی شارەکە لە رووداو و پێشهاتە سیاسییەکانی باشووری کوردستاندا.

**-ناوی تەواو و نازناوو شوێنی لەدایك بوونت؟**

ناوی تەواوم شوان محمدامین تەها خۆشناوە، وەکو بنەماڵە لە ساڵی ١٩٤١ەوە لە هەولێر دەژین، بەلآم بەهۆی رەوشی سیاسی کوردستان و پێشمەرگایەتی باوکم ؛ ٤/٤/ ١٩٧٢ لە گوندی خەلانی سەر بە ناوچەی حاجی ئۆمەران لەدایك بووم (هەرچەندە لە ناسنامەکەم ١٩٧١/٧/١ نوسراوە) وەکو زۆربەی خەڵکی کوردستان.

**-چەند وڵاتت بینیوە؟**

ئێران، تورکیا،سوریا و لوبنان.

**-چەند زمان دەزانی؟**

جگە لەزمانی دایك، زمانی عەرەبی و تا رادەیێکی گونجاو زمانی ئینگلیزی کەمێکیش سەر لە فارسی دەردەکەم.

**-بۆچی لەنێوان مەسیحیەکانی کوردستان مێژوونوسی ئەکادیمی هەڵنەکەوتوون؟**

دەکرێ کۆمەڵێك هۆکار هەبن، کریستیانەکان چ وەکو نەتەوە (کلدان ،سریان و ئاشور)،چ وەکو ئاینزا(کاسۆلیك، ئەرسەدۆکس و پرۆتستانت)پرۆسەی دابەش بوون و کۆچکردن و شوێنی نیشتەجێبوونیان کاریگەری لەسەر شێوازی ژیان و بیرکردنەوە و ئامادەگیان بۆهەر بوارێك جیاواز بێت، رەنگە لەکوردستان ئەوان بزوێنەری سەرەکی رەورەوەی مێژوو نەبوون بۆیە ئەو ئەشقەیان تێدا بەرجەستە نەبووبێ، بەڵکو هەوڵیان داوە لە بوارەکانی دیکەی زانستی رۆڵی خۆیان بگێڕن لەو لایەنەشەوە نەخش و رۆڵیان هەستی پێدەکرێت و لەزۆر بواردا کەسی پسپۆڕ و شارەزایان تێدا هەڵکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکیان هەن بایەخ بەمێژووش بدەن یاخود ئارەزوومەند بن ، پێم وایە مەسەلەکە تا ئاستێك رێژەییە ئەگەرچی هەست پێکراویش بێت.

**-بازاڕی کتێبی مێژوویی لەکوردستان چۆن دەبینی؟**

لەگەڵ ئەوەی جموجۆڵێکی زۆر هەیە ، چاپخانەو دەزگا رۆشنبیریەکان بەگەڕخراون ،لە کایە رۆشنبیریەکاندا بزاڤێك هەیە و بەسەدان کتێب و گۆڤار و رۆژنامە سالآنە دەکەوێتە بازاڕەکانەوە ،بەلآم ئەگەر سەیری تەواوی بازاڕی کتێب بکەین لەکوردستاندا لە ئاستی پێویست دانیە و بازاڕێکی کزە، بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری سەردەمەکە و بوونی تەکنۆلۆجیای نوێ ی زانیاریەکان و

...تد، بە هەزاران کتێب هەن لە ڕەفەی کتێبخانەکاندا تۆزیان لێنیشتووە و خوێنەر کەمن لەهەموو بوارە جۆر بەجۆرەکاندا سەرەڕای ئەوەش بازاڕی کتێبی مێژوویی هەرمێنی لە کتێبی بوارەکانی دیکە زیاترە، وەکو هەستی پێدەکرێت کتێبە مێژووییەکان لە بازاڕی کتێب فرۆشاندا بەشێکی بەرچاو پێک دەهێنن چ لەبواری نوسین و چ لە بواری وەرگێڕاندا.

**—بۆچی ئەگەر ئافرەت مافی خوێندنی لەکوردستاندا هەیە بەشداری ئافرەت لە نووسینەوەی مێژووی کورددا لاوازە؟**

ئەگەر ئاورێك لە مێژووی نووسینەوەی مێژوو بدەینەوە لەهەموو جیهان هەمان دیاردە دەبینینەوە، هەست بە کەمی ڕۆڵی ئافرەت لەم بوارەدا دەکرێت،ڕەنگە هۆکارەکە ئەوە بێت ئەوە شەنگ و هێز و توانای پیاوە بەرگی بزوێنەری ڕووداوەکانی مێژووی بۆخۆی دابڕیوە و داپۆشیوە، نەخشی لە گۆڕینی ڕووداوەکان هەبووە ئافرەت ئەگەر ڕۆڵیشی بینیبێت زیاتر لەپشت پەردەی ڕووداوەکان بووە،لە لایەکی دیکەوەش دید و تێڕوانینی ئافرەت بۆمێژوو ئەو گرنگیەی وەرنەگرتووە وەکو لای پیاو لە کۆڕ و کۆبوونەوە میللی و ڕۆشنبیری و سیاسییەکاندا پێویست بکات قسەیەکی هەبێت، جگە لەوانەش دەرفەتی نووسینەوەی مێژوو لای ئافرەتان بەهۆی بەڕێوەبردنی ماڵەکانیان لەوانەیە کەمتربێت.

**—ئایا سەردانی مۆزەخانەکانی کوردستانت کردووە؟**

بەڵێ.

**—لەکاتی خوێندنەوەی مێژووی کورد هەست بەچی دەکەی ؟شانازی یان غەمباربوون، یان کاری خۆت دەکەی؟**

هەست دەکەم کاری خۆم دەکەم و پێویستە تەواو ئاشنای مێژووەکە ببم،بەلأم هەرگیز ناتوانم هەستی ناسیۆنالیستانەی خۆم لەناخی خۆم بشارمەوە هەمیشە بەرامبەر غەدرەکانی مێژوو کە نەتەوەی کورد پشکی شێری بەرکەوتووە نیگەرانی دامدەگرێت و هەڵچوونم هەیە و کاتێك دەبینم گوررزی کوشندەمان لە لایەن نەتەوە هاوسێکانمان بەرکەوتووە و چەشتووە، یاخود بووینە قوربانی بەرژەوەندی زاڵدەستەکان، یانیش بووینە قوربانی سێکوچکەی (ئابوری، ئاین و دەسەلأت)،یا بووینە نێچیری راوکەران و لەنێوخۆمان تەبا نەبووین،ئەوانە دەمهەژێنن مێژوو پێمان دەڵێ یەکریز بن و تخوونی مەکەونەوە.

هاوکات لەناخەوە هێندێك جار شانازی بەداستان و سەروەرییەکان دەکەم ،بەلأم لەنووسینەوەدا هەمیشە دەبێت کاری خۆت بکەی و خۆت لەهەستەکانت دابماڵی.

**—پێت وایە رۆژنامەگەری ئەمرۆی کوردستان سەرچاوەیێکی باش بێت بۆ مێژوونووسی ئایندە پشتی پێ ببەستێ بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد؟**

بەڕای من تا رادەیێك نەخێر! چونکە هێشتا رۆژنامەی بێلایەنمان نیە جگە لەوانەی ئۆرگان و زمانحاڵن ئەوانەی دیکەش بەزۆری دەستی نێوخۆ و دەرەکی ئاراستەیان دەکات و وروژاندنی تێدایە، هەروەها پێم وایە لە ئایندەدا مێژوونووس بەهۆی ئەو زۆری و بۆریەوە دووچاری سەر لێشێواوی دێت و وەکو دەریاوانە ژێرئاویەکان توشی(نشوة الاعماق)دەبێت و بەهۆی ئەو هەموو رۆژنامە جۆراوجۆر و جیاوازانەوە لەناوی دەخنکێت و ناتوانێت راستییە مێژووییەکان بچەسپێنێ، بۆیە پێم وایە پێویستە مێژوونوسانی ئەمرۆ هاوکاری ئایندە بن و کاری لەسەر بکەن کتێبخانەکانیش زیاتر کاری ئەکادیمی ئەرشیف بکات و دام و دەزگاکانی حکومەتیش هەولی جدی بدەن بۆ ئەرشیف کردنی نوسراوە فەرمیەکانی دام و دەزگاکان بەداخەوە کەمتەرخەمی زۆری پێوە دیارە.

**-پێت وایە شتێك هەبێت بەناوی قوتابخانەی کوردی لەنوسینی مێژوودا؟**

ئومێدەوارم دروست بێت.

**-بایەخی وێنە لە بواری مێژوودا چیە؟**

وێنە دەچێتە خانەی دۆکیۆمێنتەوە، بێگومان وێنە ئاشنامان دەکات بەو سەردەمەی کەوێنەکەی تێدا گیراوە، جل و بەرگ و شێوە و مۆدێل و کۆمەڵێك شتت نیشان دەدات،هەر گرتەیەك گوزارشت لە کات و شوێنێکی دیاریکراو دەکات، تەنانەت بۆ روونکردنەوە و گەیاندنیش وەکو دەگوترێت (یەك وێنە بەرامبەر سەد وشە کاریگەرە)و زووتر بینەر دەچێتە مێشکیەوە، بۆیە وێنە مێژووییە بلاونەکراوە تایبەتییەکان، ئەوانەی لای کەسانێك هەن پێویستە پارێزگارییان لێبکرێت و ببنەوە موڵکی گەلەکەمان.

**-پێت وایە جیاوازی هەبێت لەنێوان زمانی نووسینی مێژوویی و زمانی نووسینی ئەدەبیدا؟**

بەدڵنیاییەوە،زمانی ئەدەب زمانی نوسینەوەی هەست و سۆز و عەشق و توانەوەیە و زۆرترین کار بۆ جوانی و فەنتازیا و گوزارشتی کاریگەر دەکات و نووسینەوەی ناخە، بەلام سیفەتی سەرەکی مێژوونوس ئەوەیە کە خۆی لەهەست و سۆزەکانی دابماڵێت و وەکو دادوەرێك سەیری تاوانکار و داواکار بکات و بێلایەن بێت جگە لە دەرخستنی ڕاستییەکان هیچ ئامانجێکی دیکەی نەبێت، بەلام مێژوونووس دەکرێت سوود لە وشەی گونجاو و پاراوی ئەدەبی وەربگرێت و لە شوێنی شایستە بەکاری بهێنێت ، زمانی نووسینەوەی مێژووەکە چەشەو تامێکی ئەدەبیشی هەبێت بەمەرجێك کاریگەری لەسەر لایەنگیری و سۆزداری نەبێت.

**-رات چیە بەرامبەر مێژووی زارەکی ،ئایا لەم بوارەدا کارت کردووە؟**

بەڕای من ئەگەر ئەو مێژووە بۆ وڵاتان بایەخی هەبێت ، بۆ ئێمەی کورد گەنجینەییێکە هێدی هێدی بە تێپەڕبوونی کات لە کیسمان دەچێت، بەهۆی رەوشی تایبەتی کوردستان کە خودان کیانێکی سیاسی جێگیر نەبووین لەمێژوودا زۆربەی جارەکان مێژوومان لەلایەن خەڵکەوە نووسراوە،یاخود زۆرێك لە کەسایەتی و سیاسەتوانانمان نەپرژاونەتە سەر نووسینەوەی بیرەوەری و یاداشتەکانیان و هەگبەکانیان پڕاوپڕن لە نهێنی و زانیاری شاراوە، دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو جۆرەکەسانەدا بۆ نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخ هەرگیز ناکرێت فەرامۆش بکرێن ،لەگەڵ ئەوەی دیدار و شێوازی پرسیارەکان و زیرەکی و لێهاتوویی دەوێت و توێژەر دەبێت رەچاوی کۆمەڵێك بنەما بکرێت بۆ دەرخستنی راستیەکان.

بۆ برگەی دووەمی پرسیارەکەت بەڵێ لە ماستەرەکەم ژمارەییێکی زۆری دیدارم سازداوە و ئێستاش بۆ دکتۆراکەم بەردەوامم لەو دیدارانە و هیوادارم وەکو کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان بتوانین کارێکی جدی بکەین لەسەر مێژووی زارەکی و ئەوانەی لەژیان ماون سوود لەو مێژووە شاراوەیە وەربگرین.

**–پێت وایە مێژوونووسی بێلایەن هەبێت؟**

بێلایەنی خەسلەتێکی بنەڕەتی مێژوونووسە، ئەگەر ئەو سیفەتەی نەبێت مێژوونووسی راستەقینە نیە، بەلام دەکرێت تخونی هەندێ مەسەلە نەکەوێت کەزیان بەبەرژەوەندی باڵای نەتەوەکەی بگەیەنێ، بەڵێ پێم وایە مێژوونووسی بێلایەن تا ئاستێکی باش لە نووسینەوەی مێژوودا هەبێت، بەلام مەرج نیە خۆی بێلایەن بێت بەڵکو دەستپاکە لەبوارەکەی خۆیدا.

**–مێژوو هەر سوودی هەیە یان زیانیشی هەیە؟**

پێم وانیە مێژوو زیانی هەبێت ، تەنها زیان ئەوەیە کە وشیاری مێژوویت نەبێت و پەند و عیبرەت لەمێژوو وەرنەگریت، ئەگەر نا مێژوو کۆمەڵێك سوودی هەیە ناکرێت لێرەدا باسی بکەین، بەتایبەتی بۆ نەتەوە ژێردەستەکان لەوانەیە هەندێ حالەتی دەگمەن هەبێت مێژوو زیانی بۆ دەسەلاتێك هەبێت، بەلام دواجار وەکو نوسەرێك دەلێت: مێژوو تیشکی رابردووە دەکرێ ئایندەی پێ رۆشن بکەینەوە.

**–پێت وایە رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی کوردستان وەکو پێویست بایەخیان بە بواری مێژوو داوە؟**

لە ئاستێکی باش دانیە، لەکاتێکدا پێم وایە ئەمڕۆ کاتێکی گونجاوە بۆ بایەخ دان بەم بوارە.

**–وێنەی هیچ کەسایەتییەکی مێژوویت لەماڵەوە هەلواسیوە؟**

لە ژووری کتێبخانەکەمدا و لە کۆمپیوتەرەکەمدا ئەرشیفێکی باشی وێنەی مێژوییم هەیە و هەمیشەش لە هەوڵی بەدەست هێنانی بەلگەنامەو وێنەی دانسقە دام.

**–چۆن بایەخی وەرگێڕان لەبواری مێژوودا دەبینی؟**

وەرگێڕان بە شێوازێکی زانستیانە کارێکی زانستیانەیە و لە زۆربەی ولاتاندا دەزگای سەربەخۆ و تایبەت بەبواری وەرگێڕان هەن، ئێمە پێویستیمان بە شارەزابوون لە نووسینەکانی بیانی هەیە بەگشتی و ئەوانەی باسی مێژووی کوردیان تێدا کراوە بەتایبەتی بایەخدارن و جێگەی ستایشن، لە لایەکی دیکەوە بەداخەوە نەوەی ئەمڕۆ بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆ بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەکەمی ئاشنایەتیان بەزمانەکانی تر بەگشتی هەیە بۆیە کارێکی چاکە و هەوڵی

باشیش هەیە و هەستی پێدەکرێ کە بەڕێزت یەکێکی لەوانەی هەوڵ و کار لەم مەسەلەیە دەکەن.

**-لەگەڵ ئەوەی مۆزەخانەی ئەهلی لەکوردستان بکرێتەوە؟**

بیرۆکەیێکی خراپ نیە، ئەگەر ئیمکانیاتی باشی لەپشت بێت و وشیاری و عەقلی پاراستنی ئەو سامانە نەتەوەییانە پەرەی پێبدرێ.

**-بۆ پتر خزمەتکردنی مێژووی کورد پێشنیاری چی دەکەی؟**

هەڵتەکاندن و دارشتنەوەی سەرلەبەری مێژووی کورد و پاککردنەوەی لە چەواشەکاری و پێدا هەڵگوتن، لە شێوەی ئینسکلۆپیدیاییێکی گەورەدا بە هاوکاری پسپۆڕانی نێوخۆ و دەرەکی و دارشتنەوەی بە شێواز و ڕێبازێکی زانستی پشت بەستوو بە میتۆدلۆژیای مێژوویی و هەوڵدان بۆ کردنەوەی خانەیێکی پاراستنی دۆکیۆمێنت و بەڵگەنامەکان و سوود وەرگرتن لە توانای تێکڕای مێژوونووسان(ئەکادیمی و ئارەزوومەندان) و کۆبوونەوە و پاڵپشتی کردنی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان لە هەموو لایێك.

**-ئایا مێژوونوسانی کورد لەبەر پوخت نوسی یان کەم کاتی کەم دەنووسن؟**

لەوانەیە هەردووکیان لەوانەشە هیچیان لەوانەشە کەمتەرخەمی لە دەزگا تایبەتمەندەکان هەبێت مێژوونووس ساردبکەنەوە.

**-لە هیچ نووسینێکی خۆت پەشیمانی؟**

نەخێر، بەڵام گومانی تێدانیە هەندێ نووسین چەندی پێداچوونەوەی بۆبکەی رەنگە لە قالب و فۆڕمێکی دیکەدا بیخەیتە ڕوو و زیاتر بەهێز و بەپێز تر بێت و ئاسوودەت بکات، یاخود ئەوانەی هەڵە و پەڵەی زۆری چاپی تێکەوتووە.

**-ئایا دراوسێکانی کورد هەر مێژووی کوردیان چەواشە کردووە یان خزمەتیشیان کردووە؟**

کەسانی مرۆڤ دۆست لەهەر نەتەوەیێك بن تورك یا عەرەب و فارس ویژدانی خۆیان ئاسوودە کردووە و کاری خۆیان ئەنجامداوە و خزمەتیشیان بە مێژووی نەتەوەکەمان کردووە ، هەڵوێستیان وەرگرتووە و راستیەکانیان لە گوتار و نوسینەکانیان درکاندووە، نمونەش زۆرن ئەوەتا لەتورك: ئیسماعیل بێشکجی لە عەرەب هادی عەلەوی و....هتد، لەهەمان کاتدا دەسەلاتداریتی ئەو ولاتانە گومانی تێدانیە هەوڵی فەوتاندن و ون کردن و تواندنەوەی مێژووی کوردیان داوە و زۆر جاریش بەرنامەرێژیان بۆ کردووە و هەوڵی چەواشەکاری زۆریان داوە، بەلام جار هەبووە لەپەنای چەواشەکاریدا راستی گرنگی مێژوویی دەرکەوتوون و بەخێر گەڕاینەوە .

**-چۆن وەلامی ئەو کەسانە دەدەیتەوە کەمێژوو بە درۆ دەزانن؟**

ئەو کەسانە دەتوانن زیاتر و زۆرتر بخوێننەوە،خۆ ئەوەش هەر کاری ئێمەیە راستیەکان بەدەربخەین و رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژووییش بۆ دەرخستنی راستیەکانە، بۆیە ئەو جۆرە حوکمدانانەم پێ تیژڕۆیی و خێراڕۆییە یانیش دووبارەکردنەوەی بۆچوونی کەسانێکی ترە، لەگەڵ ئەوەشدا مێژوو هێشتا تەواو پوخت نیە و رووبەڕووی چەواشەکاری بویتەوە و نکوڵی لێناکرێ، بەلام وەکو هێڵی گشتی مێژوو مێژوونووس هەست و درك بە راستیەکان دەکات و بە پێچەوانەوەش درك بە درۆکانیش دەکات و بەبەلگە و هەلێنجانەکانی(اجتهاد) هەوڵی پشت راست کردنەوەیان دەدات .

**-لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانی مێژوو کامە پێناسە بە گونجاوتر دەزانی؟**

زۆربەی مێژوونووسان پێناسەی مێژوو کورت دەکەنەوە کەوا: بریتییە لەگەران و پشکنین و لێکۆلینەوە لەرووداوەکانی رابردوو، ئەوەی ئیبن خەلدون بەلامەوە گونجاوە کاتێك دەڵێت: مێژوو بە تەنها گێرانەوەیەکی ساکاری رووداوەکان نیە بەڵکو ناسینی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانە، زنجیرەیەك زانیاری هەمەچەشنەیە و لە هەناویدا بینین و راڤەکاری و لێکۆڵینەوە هەیە.

# ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

ن: محەمەد صەبری
و: دلشاد مەحموود عەبدولڕەحمان

ئینگلتەرە لە سەرەتادا خاوەنی نشینگەگەلێکی زۆر بوو لە کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی ئەمریکای باکوور، ئەو نشینگانە زۆربەیان لە لایەن پرۆتستانتە کۆچکردووەکانی ئینگلتەرەی سەردەمی شۆڕشی پرۆتستانتی دامەزرا بوون و شانازیان بە بنەچە ئینگلیزییەکانیانەوە دەکرد، بەلام لەگەل ئەوەشدا دەیانویست بە سەربەستی بمێننەوە، بۆیە لە سالی (١٧٧٤)دا بەیداخی شۆڕشیان بەرزکردەوەو سالی (١٧٧٦) جەنگی سەربەخۆییان ڕاگەیاند.

واشنتۆن (**George Washington**)ی ڕزگارکەری ئەمریکا پاش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، ویستی خۆی گۆشەگیر بکات. بەلام گەل بۆ سەرۆکایەتیکردنی کۆمار بانگهێشتیان کردو بۆ دوو خوولی لەسەر یەك (١٧٨٩-١٧٩٦) هەلیانبژاردو لەو ماوەیەدا توانی یەکڕیزی بچەسپێنێت. دەستووری یەکێتییش کە لە سالی (١٧٨٧)دا داڕێژرا، تێیدا بەلێن درابوو **"کۆماری ولاتە یەکگرتووەکان"** لەسەر بنەما ئازادەکان بێت.

ولاتە یەکگرتووەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم لەو ناوچانە پێکدەهات کە دەکەوتنە نێوان زەریای ئەتلەسی و ڕووباری مسیسیپی، ژمارەی دانیشتوانی لە چوار ملیۆن تێپەڕی نەدەکرد. دواتر لە سەدەی نۆزدەهەم لە زەریای ئەتلەسییەوە تاوەکو زدریای هێمن کشانی بەخۆوە گرت، بەوەش

رووپێوەکەی بووە هەشت لە دەی رووپێوی کیشوەری ئەورووپا و سەد ملیۆن کەس تێیدا نیشتەجێبوون.

بێگومان دانانی دەستووری یەکێتی جێی مشتومڕی نێوان پارتە جۆراوجۆرەکان بوو، بە تایبەت لە نێوان "پارتی یەکێتییەکان"، کە خوازیاری دامەزراندنی حکومەتێکی یەکێتیی بەهێزو خاوەن سەروەری بوون بەسەر هەموو ویلایەتەکاندا، "پارتی کۆمارییەکان" کە دەیانویست لە هەر ویلایەتێکدا حکومەتێکی خاوەن سەروەری دابمەزرێنن، ئەو کارەش دوای ململانێیەکی چوار ساڵە (١٧٨٣ - ١٧٨٧) بەوە کۆتایی هات، کە چۆن یەکێتییەك لە نێوان روانگە جیاوازەکاندا دروست بکەن، ئیتر هەر ویلایەتێك لە ویلایەتەکانی یەکێتی سەربەخۆ بوون و لە هەڵسوڕاندنی کاروباریان بە قانوونە تایبەتەکانیان خاوەنی سەروەری بوون، تەنها ئەو کاروبارانە نەبێت، کە دەچنە خانەی بەرژەوەندیی هاوبەشی نێوان ویلایەتەکانو دەستووری یەکێتییش ئاماژەی پێداوە. ئیتر بۆ هەر ویلایەتێك فەرمانڕەوایەکی هەڵبژێردراو دەستنیشانکرا، کە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی لەدەستدایە، هەر ویلایەتێك بووە خاونی دەستەیەکی یاسادانان بۆ دەرکردنی قانوون و گەڵاڵەنامە (لائیحەکان)و بووە خاوەنی دادگاو قەزای تایبەت بەخۆشی.

دەستووری یەکێتی هاوبەندیی نێوان ویلایەتە جیاجیاکان بوو، کە لەسەر بنەمای جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان لە چەشنی دەستووری ئینگلیزی کە "مۆنتیسکیو" (Montesquieu) ستایشی کردووە، وەستابوو. واتە دەسەڵاتی راپەڕاندن، دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی دادوەری. "سەرۆك" مافی دەسەڵاتی راپەڕاندنی هەبوو. "کۆنگرێس" مافی دەسەڵاتی یاسادانانی هەبوو.

هەرچی دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی بوو، ئەوا لە مەسەلەکانی سوپاو جەنگ و فێرکردن و پەیماننامەکان و دراو و بازرگانی تێپەڕی نەدەکرد.

سەرۆک کۆمار بەوە لە سەرۆکەکانی ئەوروپا جیا دەکرێتەوە، کەوا دەسەلاتێکی فراوانی هەیە. بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێتو دەگونجێت جارێکی دیکە بۆ خوولێکی دیکەی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرێتەوە. سەرۆک بە تەنها بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ دەگرێت، بۆ راپەراندنی ئەرکەکانیشی کۆمەڵێك وەزیر هاوکاری دەکەن، کە لە حەقیقەتدا تەنها بریکاری ئەوونو هیچی دی. سەرۆك لە هەموو کاتێکدا مافی لەسەرکاردانانو لەسەرکارلابردنیانی هەیە، بەبێ ئەوەی بۆچوونی کۆنگرێس وەرگرێت. هەر ئەویش سەرۆکی سوپاکانی وشکانیو ئاوییە، هەڵسورێنەری سیاسەتی دەرەکییە، مافی واژووکردنی پەیماننامەو دانانی باڵوێزو فەرمانبەری هەیە، بەلام مەرجە کۆنگرێس رەزامەندی لەسەر بڕیارەکانی دەربڕێت.

کۆنگرێس لە دوو دەستە پێکدەهات، ئەنجومەنی پیران (سیناتۆ) ئەنجومەنی گشتی (نوێنەران). هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پیران لە رێگەی دەستەکانی یاسادانانی ویلایەتەکانەوە بوو، بۆ هەر ویلایەتێك دوو ئەندام بەبێ رەچاوکردنی ژمارەی دانیشتوان. هەرچی ئەنجومەنی گشتی بوو، ئەوا هەڵبژاردنی بۆ ماوەی دوو ساڵە لە رێگەی هەڵبژاردنێکی گشتییەوەو بە گوێرەی رێژەی دانیشتوانی هەر ویلایەتێکە. کاتی کۆبوونەوەکانی کۆنگرێسیش لە کاتی دیاریکراودا بەرێوەدەچێت.

دەسەڵاتی دادوەریش لە چوارچێوەی "دادگای باڵا"دا کۆکرابۆوەوە، کە لە نۆ دادوەر پێکدێتو لەلایەن سەرۆکی کۆمارەوە دەستنیشان دەکرێت تا لە ژیاندا مابن، ئەرك و کاریان چاو خشاندنەوەیە بە هەموو ئەو ململانێیانەی کە لە نێوان

ویلایەتەکان یان لە نێوان کۆنگرێس و سەرۆکی کۆماردا دێتە ئارا. "دادگای بالا" مافی هەڵوەشاندنەوەی هەر بڕیارێکی یان سزایەکی هەیە، کە پێی وابێت پێچەوانەی دەستوورە.

دەتوانرێت بوترێت "دادگای بالا" خاڵی هاوسەنگیی دەستووری ئەمریکییە. بۆیە هەندێك کەس حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکان بە **"حکومەتی دادوەران"** ناوزەد دەکەن. لە واقیعدا، ئەم دەستوورە نێوەندێکە لە نێوان مەلەکیەتی پابەند و رژێمی نوێی پارلەمانی، کە "مەلەکیەتی دەستووری" لە گشت دەسەلاتە کردارەکییەکان دادەماڵێت و بەرپرسارێتی لە وەزیرەکاندا کۆدەکاتەوە.

دەستوور گونجانی هێنابووە کایە لە نێوان ویلایەتەکانی باکوور؛ کە سپی پێستەکان تێیدا نیشتەجێن و بە تەنها زەوی دەکێڵن، لەگەڵ ویلایەتەکانی باشوور، کە خاوەن موڵکە گەورەکان کۆیلەکانیان بۆ کشتوکاڵکردن بەکار دەهێنا. هەروەها دەستوور رێگەی بە ویلایەتەکانی باشوور دابوو رژێمی تایبەت بە خۆیان بپارێزن، کە ئاماژەیە بۆ رژێمی کۆیلایەتی، ئەوەش مایەی قێز لێبوونەوەی ویلایەتەکانی باکوور بوو.

## بەرفراوانبوونی ولاتە یەکگرتووەکان:

ولاتە یەکگرتووەکان پێشتر تەنها ناوچەکانی نێوان زەریای ئەتڵەسی و چیای لیگانی دەگرتەوە و لە سیانزە ویلایەت زیاتر نەبوو، کە هەندێکیان زەوی بەرفراوانیان لەژێر دەستدابووو تا رووباری مسیسیپی گرتبووە خۆ، بەلام حکومەتی یەکێتی دەستی بەسەر ئەو زەویانەدا گرت و ساڵی (١٧٨٧) گەلاڵەنامەیەکی دەرکرد بۆ رێکخستنی ئاوەدانکردنەوەیان و ئەو گەلاڵەنامەیە بووە بەردی بناغەی دامەزراندنی ناوچەو ویلایەتە نوێیەکانی دیکە.

ئەو زەوییە نوێیانە دابەشکرانە سەر چەند ناوچەیەكو حکومەتی یەکێتی لە هەر ناوچەیەکدا حوکمڕانێکی بۆ دانا، کە لەسەرەتادا بە تەنها حوکمی دەکرد، تا ژمارەی دانیشتوانیان گەیشتە پێنج هەزار کەس، ئینجا ناوچەکە بۆ خۆی حکومەتێکی دروست دەکردو دەستەی یاسادانانو ئەنجومەنی نوێنەرایەتی بۆ هەڵدەبژێردرا. هەر ناوچەیەك ئەندامێکی دەنارده کۆنگرێس بە مەبەستی راوێژکردنی بۆچوونەکانی. چونکە هزرەکە بەرەو ئەو رووە بوو کە هەرچی زووتره دانیشتوان بۆ خۆیان توانای هەڵسوڕاندنی کاروباری خۆیان هەبێت. ئەگەر هاتوو ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە خۆیدا لە پەنجا هەزار کەس، ئەوا ناچەکە دەبووە ویلایەتێکی سەربەخۆ دەیتوانی داوای چوونە ریزی یەکێتیی گشتی بکات.

ولاتە یەکگرتووەکان لەبەر ئەوەی لە بازنەیەکی دیاریکراودا گیری نەخواردبوو، بەڵکو بەرەو بەرفراوانبوون و گەورەبوون دەچوو، سەرەتا ئەم بنەمایە بەسەر ناوچەی یەکەم لە رۆژئاوای دوور (**Far West**) پیادە کرا، کە کەوتبووە نێوان ویلایەتەکانو رووباری مسیسیپی. لە ئاکامی ئەوەشدا لە نێوان ساڵانی (١٧٩١ – ١٧٩٦)دا سێ ویلایەتی دیکە هاتنە ریزی کۆماری ولاتە یەکگرتووەکانەوە.

فەرەنسا لەو دیوی رووباری مسیسیپی، ناوچە بەرفراوانەکانی "لویزیانا"ی لەژێر دەست دابوو، کە پێشتر، لە ساڵی (١٧٦٣)دا بۆ ئیسپانیا دەستی لێهەڵگرتبوو، دواتر ناپلیۆن [ناپلیۆن بۆناپەرت (**Napoleon Bonapart**) (١٧٦٩– ١٨٢١). وەرگێڕ] ئەو ناوچانەی بەدەست هێنایەوە، تاوەکو نشینگەیەکی گەورەی فەرەنسی تێدا دامەزرێنێت. کاتێك ناپلیۆن، پاش پێشێلکردنی "ئاشتەوایی ئەمیان" [پەیماننامەی ئەمیان ساڵی (١٨٠١) لە نێوان

بریتانیاو فەرەنسادا مۆرکرا. وەرگێر]، هێزێکی دەریایی پێوستی ئەوتۆی نەبوو بۆ پاراستنی "لویزیانا" لە بەرامبەر هەڵمەتی ئینگلیزیدا. بۆیە لە ساڵی (١٨٠٣)دا وای بە چاکزانی بە ولاتە یەکگرتووەکانی بفرۆشێت. بەوەش سنوورەکانی ئەمریکا گەیشتە چیاکانی رۆکیو زەریای هێمن لە رۆژئاوادا.

ئیسپانیا نیمچە دوورگەی فلۆریدای بەدەستەوە بوو، ساڵی (١٨٣٠) ولاتە یەکگرتووەکان کڕییەوەو لە ساڵی (١٨٤٥)دا کردییە ویلایەتێك. مەکسیکیش هەموو زەوییە بەرفراوانەکانی باشووری رۆژئاوای ئەمریکای باکوور "تکساس، نیو مەکسیکۆ، کالیفۆرنیا"ی بەدەستەوەبوو، کۆمەڵێك لە سەرەرۆکانی ئەمریکایی چوونە "تکساس"و سەربەخۆیی ئەو ناوچەیەیان راگەیاند، ساڵی (١٨٣٥) رژێمی کۆمارییان تێدا دامەزراند و توانیان لە ساڵی (١٨٤٦)دا، بە ولاتە یەکگرتووەکانەوەی بلکێنن. لە ئەنجامدا جەنگ لە نێوان مەکسیكو ولاتە یەکگرتووەکان بەرپابوو، کە بە ژێرکەوتنی مەکسیكو دەست هەڵگرتن لە "نیو مەکسیکۆ، کالیفۆرنیاو تکساس" بۆ ولاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٨٤٨)دا کۆتایی هات.

دواتر ولاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٨٤٦)دا، بە گوێرەی رێککەوتنێك لەگەڵ ئینگلتەرە، دەستی گرت بەسەر هەرێمی "ئۆریگۆن" کە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوا. بەوەش پێکهاتەی ولاتە یەکگرتووەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا کۆتایی هات. ئیدی ولاتە یەکگرتووەکان بریتیبوو لە سیو سێ ویلایەت، تێکڕای رووبەرەکەی حەڤدە جار هێندەی رووبەری فەرەنسا بوو، کە سنوورەکانی رۆژهەلات و رۆژئاواو باشووری دەکەوێتە نێوان زەریای ئەتڵەسی و زەریای هێمنو کەنداوی مەکسیك.

## زۆربوونی سامان و دانیشتوان:

ئەمریکییەکان بە دەستپێشخەری و کارکردن و تەگبیری چاك ناسران، توانیان لە ماوەی سەدەیەکدا بیابانە بەرفراوانەکان وەرچەرخێنن بۆ دەوڵەتی زەبەلاح، کە شانازی بە دانیشتوان‌و شارستانییەت‌و سامانەکانیانەوە بکات. پاش ئەوەی دانیشتوانی لە چوار ملیۆن کەس زیاتر نەبوو، لە ساڵی (١٨٥٠)دا خۆیدا لە (٢٣) ملیۆن‌و لە ساڵی (١٩١٣)دا گەیشتە (٩٣) ملیۆن کەس. بێگومان هۆی کۆچکردن بۆ ئەمریکا، هەر لە سەرەتاوە، لە گەورەترین هۆیەکانی گەشەکردنی دانیشتوان‌و ئاوەدانی بوو لەو ولاتە دوورە دەستەدا. دەبێت ئەوەش بزاندرێت، کە بزاوتی کۆچکردن بۆ ئەمریکا تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەهێزو بەرفراوان نەبوو. واتە دوای ئەوەی ئەمریکییەکان بوونە یەکەیەکی نەتەوەیی سەربەخۆ.

ژمارەی کۆچکردووانی ئەوروپایی، دەوروبەری ساڵی (١٨٥٠)، دەگاتە سێ ملیۆن کەس. پاش ئەوە ژمارەیان وردە وردە زیادی کرد، تاوەکو لە ساڵی (١٩٠٥)دا گەیشتە (٢٣) ملیۆن کەس، لەوانە شەش ملیۆنیان ئیرلەندی و پێنج ملیۆنیان ئەڵمانی‌و دوو ملیۆنیان ئینگلیز بوون. ئەمانە گرنگترین رەوەندی بیانی بوون، کە شوێنپەنجەی دیاریان لە بوارەکانی ئاوەدانی‌و سیاسیی ولاتە یەکگرتووەکاندا هەبوو.

کۆبوونەوەی ئەم کۆچکردووە ئەوروپاییانە لە ماوەی حەفتا ساڵی کۆتاییدا، بۆ گرانیی گەورە لە ئیرلەندە (١٨٤٧– ١٨٥٤)و دۆزینەوەی کانزای زێڕ لە کالیفۆرنیا (١٨٤٨)و رێکخستنی گواستنەوەو کورتبڕی ماوەو تێچوونی نێوان ئەوروپاو ئەمریکاو زیادبوونی بەرچاوی دانیشتوانی (ئەڵمانیاو ئینگلتەرە) دەگەڕایەوە. ئیرلەندییەکان بە شێوەیەکی تایبەت لە ویلایەتی نیویۆرك‌و گەورە ولاتی پیشەسازی، کە کەوتبووە سەر دەریای ئەتڵەسی، نیشتەجێببوون.

ئـەڵمانـەکـان لـە نیویـۆرك گردبوونـەوە، کـە ژمـارەیـان گەیـشتە پێـنج یـەکـی دانیشتوان. هەروەها لە باشووری دەریاچە گەورەکانی دەوروبـەری شـیکاگۆو لـە سەرووی رووباری مسیسیپیدا نیشتەجێبوون. ئەڵمانەکان خاوەنی کۆمەڵێکی بـە دەسەڵات بوون لە ئەمریکای باکووردا.

ئەمریکییەکان بەوە دەناسرێنەوە کە ناوچە بەرفراوانە قاقڕەکانیـان بـە هـۆی بەکارهێنانی نوێترین ئامرازەکانی پێشکەوتنی ماددی ئاوەدانکـردەوە. هـەروەهـا ژیرانە درکیان بە گرنگـی هێڵـە ئاسـنییە گـەورەکـان کـرد. بۆیـە هێڵـی ئاسـنینی "پاسفیك"یـان راکێـشا، کـە درێژیـەکـەی لـە سـاڵی (١٨٦٩)دا خۆیـدا لـە (٥٢٠٠) کلیۆمەتر. هێڵە ئاسنییە ئەمریکییەکان لە ساڵی (١٨٦٠)ەوە زیاتر بوو لە هەمـوو هێڵەکانی ئەوروپا. راکێشانی هێڵـی ئاسـنی لـە مـاوەی سـی سـاڵان، (١٨٦٠) بـۆ (١٨٩٠)، دەگاتە دوو سەد هەزار کیلۆمەتر. لە ولاتە یـەکگرتـووەکـانی ئـەمڕۆدا، لانیکەم چوار سەد هەزار کیلۆمەتر هێڵی ئاسنی هەیە.، ئـەوەش بـە واتـای پێـنج یەکی هەموو هێڵە ئاسنینەکانی جیهان دێت.

ئەم تۆڕە ئاسنینانە گەورەترین هۆ بوون بۆ دروسـتبوونی شـارو گونـدەکـانو ئاوەدانی ناوچە بە پیتەکان. بۆیە هەر وێستگەیـەك لـە نـاوەڕاسـتی بیابانـدا، بـە خێرایی دەبووە شارێکی نوێو ئاوەدانو شوێنی سەرهەڵدانی چاپخانەو رۆژنامـەو رووناکیو تەلەگراف. "شیکاگۆ" لە ساڵی (١٨٥٠)دا تـەنهـا (٣٠,٠٠٠) نیـشتەجێی تێدابوو، لە ساڵی (١٨٧٠)دا دانیشتوانی گەیشتە (٣٠٠,٠٠٠)و لە سـاڵی (١٩١٠)دا، خۆیدا لە دوو ملیۆن کەس. "سان فرانسیسکۆ"، کە لە کۆتایی هێڵی "پاسـفیك" بنیاتنرابوو، ساڵی (١٨٤٦) هیچ وجوودی نەبوو؛ ساڵی (١٨٨٠) (٢٥٠,٠٠٠) کـەس تیایدا نیشتەجێبوون.

بە هۆی گشتاندنو بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی ئاودێری، رووبەری زەوییە کشتوکاڵییەکان بە رێژەیەکی یەکجار زۆر زیادی کرد، بەو رادەیەی ساڵی (١٩٠٠) زەوییە کشتوکاڵییەکان گەیشتە شەش هێندەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ولاتی فەرەنسا. بەوەش ولاتە یەکگرتووەکان بووە یەکەم ولاتی کشتوکاڵی لە جیهاندا، کە بە بەروبوومی پەمۆو دانەوێڵە بەناوبانگ بوو.

هەروا پیشەسازییەکانی ئەمریکایی چالاکبوون، بۆیە ولاتە یەکگرتووەکان بووە یەکەم ولاتی پیشەسازی لەجیهاندا. ئەوەش لە ئەنجامی بوونی سامانە کانزاییەکانی وەك: خەڵوزی بەردیو ئاسنو مسو نەوت. ولاتە یەکگرتووەکان بە پیشەسازی چنینیش بەناوبانگ بوو، کە توانی رکابەری ئینگلتەرە بکات لە پیشەسازییە پەمۆییەکان، فەرەنسا لە پیشەسازییە ئاوریشمییەکانو پیشەسازی لە قالبدانو پۆڵاو ئامادەکردنی ئامێرەکانی هێڵی ئاسنی.

بەهای پیشەسازییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان لە نێوان ساڵی (١٨٦٠) و (١٩٠٠)، لە (٣٨٠) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینیەوە بۆ (٢,٦٨٠,٠٠٠,٠٠٠) زیادی کرد. ئەوەی یارمەتیدەری هاتنە ئارای ئەم بزاوتە پیشەسازییە زەبەلاحە بوو، بوونی سەرمایەکی گەورە بوو. ساڵی (١٩٠١) پارە وابەستەکان بە کارە پیشەسازییەکانەوە بە پەنجا ملیار فرەنك (دوو ملیار جونەی) دەخەملێندرا. ولاتە یەکگرتووەکان بە داهێنانی رژێمی ناسراو بە ترەست (**Trust**) ناوبانگی وەرگرت، کە رژێمێکی بازرگانیی داراییی بەرفراوانبوو لە کۆمەڵێك رێکخراوی پیشەسازی یان کۆمپانیای گواستنەوەو گەیاندن پێکدەهاتو زامنکەری بەرژەوەندییەکانیان بوون، جا ئەو بەرژەوەندییانە چ پەیوەندی هەبێت بە قۆرخکردنی بەرهەمێنان چ پەیوەست بێت بە دابەشکردنی رەنێوهاتووەکان یان پیشەسازییەکی دیاریکراو لە ولاتدا.

ئەم رژێمە گەورانە، بە هۆی توانای دارایی‌و دەسەلاتیان لە کۆنگرێس‌و لە نێو پارت‌و فەرمانگە حکومەییەکاندا، توانیان باڵ بکێشن بەسەر بازاڕی ناوخۆدا. نەخشەو پلانی ئەو رژێمانە بریتیبوو لە بەرگریکردن لە بنەمای پاراستنی بازرگانی‌و سەپاندنی باجە گومرگییە بەرزەکان بەسەر کالای هاوردە لە دەرەوەی ولاتدا. بەم رێگەیە لەناوخۆدا توانیان کۆنترۆلی بازاڕە بازرگانییە داراییەکان بکەن‌و نرخەکان، تاڕادەی خستنەوەی گومان، هەلکێشن‌و هەموو رکابەرایەتییەکیش، کە رێکخراوەکان یان کۆمەلە جیابۆوەکان پێی هەلدەستن، بکوژن. لە گرنگترین ئەم رژێمانەش، بەرێوەبردنی رێکخراوەکانی گواستنەوە یان کۆمپانیاکانی هێلی ئاسنی بوون.

بێگومان ئەم رێکخراوانە، بە هۆی سەرمایەکانیانەوە، بە تایبەت پاش کاولکارییەکانی جەنگی سڤیل، یارمەتییەکی زۆریان پێشکەشکرد بۆ دروستکردنی کارخانەو کارگەکان‌و گەیاندن‌و لەکارنانی کانە دەولەمەندەکان‌و دارستانەکان، هەروەها پێشخستنی پیشەسازییەکان‌و کشتوکال‌و بازرگانی لە ویلایەتەکانی باکوورو باشووردا. لەگەل هەندێشدا، نەدەبوو خەلك بە نرخە بەرزکانیان دووچاری شەکەتی بکەن‌و دەبوو سنوورێکیان بۆ چاوچنۆکی ماددی هەبوایە، بە تایبەت کاتێك ئەو کەسە داراییانەی کاروباری ولاتیان هەلدەسوڕاند، سامانێکی زەبەلاح‌و قازانجێکی ئابڕووبەرانەیان دەستکەوتبوو.

حکومەتی یەکێتی پالپشتی ئەو رێکخراوە قۆرخکارییانە بوو، جیاووکێکی زۆری پێ بەخشیبوون. لەو سەروبەندەدا، سەندیکا کرێکارییەکان دامەزران بۆ داواکردنی زیادکردنی کرێی کارو کەمکردنەوەی کاژێری کارو نەرمی نواندن لە کاتی نەخۆشبوونی کرێکاران‌و دەستەوەستانیان. "رێکخراوی سوارچاکانی کار"یش سالی (١٨٦٩) لە "فیلادلفیا" دامەزراو بەرفراوانبوو. کرێکاران لە گشت

ویلایەتەکانەوە تێکەڵ بەو رێکخراوە بوون، بەو ئەندازەی ژمارەیان لە ساڵی (١٨٨٦)دا خۆیدا لە ملیۆنێك کەس. بە شێوەیەکی گشتی، ئەو رێکخراوە بووە رێکخراوێکی نیشتمانی، ئامانجی بریتیبوو لە باشترکردنی بارودۆخی کرێکاران لە بەردەم (زیادبوونی هێزی پولدارە بێزارکەرەکان و هەرەشەکانی گەورە رژێمە بازرگانییەکان، کە پێویستی دەکرد لە سنووری خۆیان بوەستێنرێن بەر لەوەی پەرێشانی و کەمبایەخی لەسەر شانی رەش وورووتی هەرە گەورە بێنێتە کایەوە).

کۆنگریس لە ساڵی (١٨٩٠)دا ناچاربوو قانوونێك دژی سەرجەم رێکخستنە بازرگانییەکان دەربکات، کە کار بۆ کۆت و پێوەندکردنی ئازادیی بازرگانی دەکەن، جا چ لەنێو ویلایەتەکانی یەکێتیدا بێت چ لە نێوان یەکێتی و ولاتە بیانییەکاندا بێت.

حکومەتی یەکێتی لەژێر گوشاری رای گشتییدا، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، توانی لە ئەنجامی سەرهەڵدانی گەورە ئابڕووچوونە داراییەکان بەدواداچوون بۆ ئەو رێکخستنانە بکات لە بەردەم دادگاو هەروەها "یەکێتیی کۆمپانیاکانی نەوت"و "یەکێتیی کۆمپانیاکانی جگەرە"و هاوشێوەکانی ئەو رێکخستنە بەهێزە بازرگانییە داراییانە هەڵبوەشێنێتەوە.

ولاتە یەکگرتووەکان بە سامانە زەبەلاحەکەی، دانیشتوانەکەی، پیشەسازییەکەی و بازرگانییەکەی کە وەسفکردنیان لە سنوور بەدەرە، چووە ریزی ولاتە زلهێزەکان. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، بەرهەمهێنانی خەڵووزی گەیشتە (٢٣٠) ملیۆن تەن لە (٧٢٠) ملیۆن تەنی تێکڕای خەڵووزی بەرهەمهێنراوی جیهان. بەرهەمهێنانی ئاسنی خۆیدا لە (٢٥) ملیۆن تەن لە (٧٩) ملیۆن تەنی تێکڕایی ئاسنی بەرهەمهێنراوی جیهان. بەرهەمهێنانی مسی بووە (٢٥٧,٠٠٠) تەن لە (٤٧٠,٠٠٠) تەنی تێکڕای مسی بەرهەمهێنراوی جیهان.

ولاتە یەکگرتووەکان لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا قەرزاری بێگانە بوو، بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە بەرفراوانەکانی پشتی بە سەرمایەی ئەوروپی بەستبوو. بەلام لە دواتردا، سەرچاوە سروشتییەکانی بەکارخراو خۆشگوزەرانی لە سەرلەبەری ناوچەکانیدا بلاوبۆوە. هەروەها بەرهەمهێنراوەکانی ولاتە یەکگرتووەکان، کەوتە ململانێ لەگەڵ گەورە پیشەسازییەکانی جیهان. دەستکرا بە ناردنی بەرهەمهێنراوەکانی بۆ دەرەوەی ولاتو لە ولاتە دوورەکاندا کەوتە سۆراخی بازاڕی نوێ. لە ئەورووپاشدا پشکەکانی کۆمپانیاکانی ولاتە یەکگرتووەکان بە ملیۆنەها دابەشبوو.

## جەنگە سڤیلییەکان (مەدەنی):

گەلانی ئەورووپی کە خاوەنی نشینگە بوون لە ئەمریکا، بۆچاندنی قاوەو قامیشی شەکر کۆیلەیان بەکاردەهێنا، ئەو کۆیلانە بە زۆری لە کەناراوەکانی ئەفریقی دەکرِدران. لە واقیعدا، ئەو کۆیلانە لە خەڵکانی دیکە زێتر بەرگەی زەحمەتی کاریان دەگرت لە ناوچە گەرمەکاندا، لە ئەورووپادا، لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسی بزووتنەوەی ناڕەزایی گشتی دژی کۆیلەداری دەستپێکرد، لەو ئاکامەدا ولاتی سوید ساڵی (١٨٤٧) سیستەمی کۆیلەداری هەڵوەشاندەوە، فەڕەنساش لە ساڵی (١٨٤٨) کارپێکردنی راگرت دواتر ولاتانی دیکە هەمان هەنگاویان هەڵنا.

هەرچی لە ولاتە یەکگرتووەکان بوو مەسەلەی کۆیلەداری هۆیەك بوو بۆ بەرپابوونی جەنگە سڤیلییە وێرانکارەکان. بەوەی هەر دوو ویلایەتی "جۆرجیا"و "کارۆلینا"، کە دەکەونە بەشی باشووری رۆژهەلاتی ولات لە رووبەری بەرفراواندا لۆکەیان دەچاند، بۆ ئەو مەبەستەش ئەوانە دەبوو کۆیلەکان بەکاربهێنن، بە تایبەت دوای ئەوەی کە سەلمێندرا بەرهەمی لۆکە سەرچاوەی گەورەی سامانی

ولاتە. دوو ویلایەتی "ماریلاند"و "ڤێرجینا" کە کەش و هەواکەیان بە کەڵکی چاندنی لۆکە نەدەهات بە کاری پەروەردەکردن و هێنانی کۆیلەوە خەریك بوون، گەورە مۆڵکدارەکان و جوتیارەکان لەو ناوچانەی لۆکە دەچێندرێت کۆیلەیان لەو ویلایەتانە دەکڕی.

لە ئەنجامی ئەوەدا ژمارەی کۆیلەکان لە ویلایەتەکانی باشووردا زیادی کردو بازرگانی کۆیلە تەشەنەی سەند، هەرچەندە یەکێك لە ماددەکانی دەستوور ساڵی (١٧٨٧) جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە "لە هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکان نابێت لەگەڵ دەستپێکی ساڵی (١٨٠٨) کۆیلە بهێندرێت". کەچی سەرباری ئەوە فەرمانبەرانی ویلایەتەکانی باشوور پاش ساڵی (١٨٠٨) لە ڕێگای قاچاغەوە بەردەوامبوون لە هاوکاریکردنی هێنانی کۆیلە بۆ ناو ئەمریکا. کۆیلەکان ساڵی (١٧٩٠) ژمارەیان (٧٠٠,٠٠٠) بوو، کە لەو ژمارەیە (٤٠,٠٠٠) لە هەشت ویلایەتەکانی باکوور بوون و(٦٦٠,٠٠٠) لە ویلایەتەکانی باشوور بوون. ساڵی (١٨٢٠) ژمارەیان خۆیدا لە یەك ملیۆن و نیو لە کۆی گشتی دانیشتوانی باشووری ئەمریکا کە بریتیبوو لە (٤,٤٣٥,٠٠٠) کەس. لە کاتێکدا دانیشتوانی سپی پێستی باکوور زیاتر بوون لە پێنج ملیۆن کەس، تەنانەت نوێنەرایەتی ویلایەتەکانی باشوور لە کۆنگرێسی ئەمریکی لەسەر ئەو ئیعتبارە بوو کە پێنج ڕەش پێست بەرامبەر بە سێ سپی پێستە، بۆیە سیستەمی کۆیلەداری بە تێپەڕینی کات بووە پرەنسیپی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە باشووردا، ئەوەش هۆی دواکەوتنی بوو لە بواری ئاوەدانی و پێشکەوتندا بە بەراورد لەگەڵ باکووری، کە خەڵکە ئازادەکەی ئەهلی پێشکەوتن و فیکرو کاربوون لە بوارە زانستی و هونەری و پیشەسازییە هەمە چەشنەکاندا.

ململانێیەکی بەردەوام لە نێوان باکوورییەکان و باشوورییەکاندا هەبوو، هەر کاتێکیش کۆنگرێس بیویستایە ویلایەتێکی نوێ یان ناوچە نوێیەکان بە یەکێتییەوە بلکێنێت ململانێکە رژدتر دەبوو لە نێوانیان. گروپی یەکەم (باکوورییەکان) داوای قەدەغەکردنی کۆیلەداری دەکرد لە کاتێکدا گروپی دووەم (باشوورییەکان) داوای پەیڕەوی لە سیستەمی کۆیلەداری دەکرد.

هەندێك کەسایەتی سالی (١٨٨٣) بەناوی مرۆڤایەتی‌و مەسیحییەتەوە دەستیانکرد بە داواکردنی قەدەغەکردنی کۆیلەداری، نووسەر و ئەدیبان پەرێشانی کۆیلەو ئەوەی لە ئەنجامی بوونی ئەو سیستەمەوە دێتە ئارا وێنایان کرد بەوەی کە نزمبوونەوەیە لە ئاکارو ئەخلاقی گشتی کۆمەڵ. سالی (١٨٥٤) لە باکوور پارتی کۆماری هاتە کایە، کە جەنگی دژی کۆیلەداری راگەیاندو هەڵبژاردراوەکەشی کە "ئەبراهام لینکۆڵن" (**Abraham Lincoln**) بوو لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەستهێناو لە (٦ی تشرینی دووەمی ١٨٦٠) بووە سەرۆك کۆمار.

ویلایەتەکانی باشوور کاتێك وای بۆچوون کە کۆیلەداری بەسوودترە لە یەکێتی، بۆیە هەندێکیان بڕیان لە جیابوونەوە کردەوە لە یەکێتیی کۆماری، بە تایبەت دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆك کۆماری لەلایەن "لینکۆڵن"ەوە. بۆیە بە خێرایی ویلایەتی (کارۆلینا) جیابوونەوەی راگەیاندو نوێنەرانی لە (٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٨٦٠) لە کۆنگرێس کشاندەوە، بە دوایدا هەموو ویلایەتەکانی باشوور ئەو هەنگاوەیان هەڵنا، لە (٤ی شوباتی سالی ١٨٦١) یانزە ویلایەتە جیابۆوەکە لە کۆنگرێس، کۆبوونەوەو دەستووری ویلایەتەکانی ئەمریکای یەکگرتوویان راگەیاندو "جیفرسۆن داڤیز" (**Jefferson Davis**) بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردراو شاری "ریچمۆند"یان کردە پایتەخت.

لە ئەنجامی ئەوەدا جەنگ لە نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشوور هاتە ئاراو چوار ساڵی خایاند (١٨٦١– ١٨٦٥). باکوور بە هۆی زۆری ژمارە (دانیشتوانی باکوور (١٩) ملیۆن سپی پێست و باشوور (١٢ ملیۆن) بوون کە لە نێوانیاندا (٤ ملیۆن) کۆیلە هەبوو) و پێداگیری "لینکۆڵن"و بۆچوونە رەسەنەکانی و ئارامگرتنەکانی سەرکەوتنی بەدەستهێنا. سەرکردەی باکوور "گرانت" (Ulysses Simpson Grant) لە (نیسانی ١٨٦٥)دا شکستی یەکلاکەرەوەی بە سەرکردەی باشوور "روبەرت لی" (Robert Lee) هێنا، بەوەش جەنگ دوای ئەوەی تەنها لەسەر باکوور بە تیاچوونی (٣٠٠,٠٠) هەزار پیاو (٦٠٠) ملیۆن جونەیی وەستا، کۆتایی پێهات.

کۆنگرێسی یەکێتی لە (تەمووزی ساڵی ١٨٦٢) کۆیلەداری لە ویلایەتەکانی یەکێتی هەڵوەشاندەوەو لە (حوزەیرانی ساڵی ١٨٦٣)یشدا لە ویلایەتە هەڵگەڕاوەکان کۆیلەداری رەتکرایەوە. لە کۆتاییدا هەموارکردنی دەستوور هاتە کایەوەو جەختی لەسەر رەتکردنەوەی کۆیلەداری کرد بە هەموو چەشنێك لە ولاتە یەکگرتووەکاندا. لە دواتردا، کۆنگرێسیش بڕیاریدا کە کۆیلەکان هەمان مافی سیاسیان هەبێت کە سپی پێستەکان هەیانە.

ئیدی لەو رۆژگارەوە "کێشەی رەشایەتی" (Negro Problem) سەری هەڵدا. کۆیلەکان لە ساڵی (١٧٩٠)دا ژمارەیان لە (٨٠٠,٠٠٠) هەزار تێپەڕی نەدەکرد، بەڵام لە دواتردا ژمارەیان زیادی کردو خۆیدا لە (١٠) ملیۆن کەس یان دەیەکی دانیشتوانی ولاتە یەکگرتوەکان. تاوەکو ئێستاش سپی پێستەکان، بە هۆی جیاوازیی رەگەزو رەنگو رەچەڵەکەکان، تۆویی ناحەزایەتیو بێ بایەخیان بەرامبەر بە رەش پێستەکان لە دڵدایە. رەش پێستەکان تەنانەت شوێنی

تایبەتیان هەیە لە ترام، فارگۆنی شەمەندەفەرو هۆتێل و کلێساو شتی دیکە، ئەوانە بە تەوەزەلیو بەدرەفتاریو مەیلبوونیان بۆ گێرەشێوێنی بە ناوبانگن.

سەرباری یەکسانیان لەگەڵ سپی پێستەکان لە بەردەم قانون، سپی پێستەکانی باشوور تاوەکو لە هەڵبژاردنەکان رەش پێستەکان دوورخەنەوە، بە هەموو شت بیانوو دەگرن. لە حکومەتی یەکێتی بە پێچەوانەی دەستوورەوە، لە سۆنگەی ئەو کارانەوە تەنها ئەندامەکانیان شوێنیان دەبێتەوە، زۆرجاران ئەمریکییەکان وا بیریان کردۆتەوە کە بە کۆمەڵ کۆیلەکان لە کۆڵ خۆیان بکەنەوەو دووریانبخەنەوە بۆ دوورگەکانی فیلیپین یان هەندێك لە ناوچە دوورەدەستە بەرفراوانەکانیان[1].

## پرەنسیپی مۆنرۆ:

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ولاتە یەکگرتووەکان بەهێزو بەرفراوان بوو، نەتەوایەتییەکەی روونبۆوە، هۆشیاربۆوە لەو مەترسییەی کە لە ناوچە دراوسێکانەوە لە لایەن هەندێك لە ولاتە ئەوروپییەکانەوە پەیدا بووەو بۆتە لەمپەر لە بەردەم فراوانخوازییەکانی لە کیشوەری ئەمریکی. ناوچەی "ئالاسکا" کە بەناوبانگ بوو بە راوو کەوڵەکانی لە ساڵی (١٨١٥)دا سەر بە رووسیا بوو، بریتانیای گەورەش قەناعەتی بە موڵکە بەرفراوانەکەی لە کەنەدا نەدەهات و دەیویست ناوچەکانی "ئۆریگۆن" کە لە نێوان چیا بەردینەکان و زەریای هێمندا درێژ دەبێتەوە بکاتە موڵکی خۆی، موڵکەکانی ئیسپانیاش لە سەری "هۆرن" بۆ باکووری "سان فرانسیسکۆ" درێژ دەبۆوە. لە ئەمریکای باشووریش جگە لە (بەرازیل و جیان) ئەمریکای ناوەراست، مەکسیك، جوانترین دوورگەکانی

"ئەنتلس"و هەموو ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە رۆژئاوای مسیسیپی، کە ئێستا بە (کالیفۆرنیا، نیڤادا، ئاریزۆنا، نیومەکسیکۆ، تیکساس، کینساس و ئۆکلاهۆما) ناسراوە لەگەڵ فلۆریدای رۆژهەلاَت مولَکی ئیسپانیا بوون.

ئیسپانیا لەبەر ئەوەی سایەی خۆی بەسەر هەموو کەنارەکانی (مەسکیك)دا سەپاندبوو، بۆیە ولاَتە یەکگرتووەکان بێ توانا بوو سەبارەت بە پتەوکردنی مولَکەکانی لە سنوورە سروشتییەکانی خۆی تاوەکو دەسەلاَتی ئیسپانی لە ئەمریکا کەم نەکاتەوە. وا رێکەوت "ناپلیۆن" کە چاوتێبڕینی هەبوو لە ئیسپانیا، بە سوپایەك لەژێر سەرکردایەتی "میرات" هێرشی بردە سەری و بنەماڵەی دەسەلاَتداری ئیسپانیای سەراوژوور کردو براکەی خۆی بە ناوی "یووسف" ساڵی (١٨٠٨) کردە پاشا، ئیسپانەکان بە توندترین شێوە بەرەنگاری بوونەوە. بەو شێوەیە جەنگ بۆ ماوەی پێنج ساڵان (١٨٠٨-١٨١٣) درێژەی کێشا.

ئەم کودەتایە یارمەتی بلاَوبوونەوەی شۆڕشی دا لە نشینگەکانی ئیسپانی لە ئەمریکای باشوور کە ئیسپانیا بە باج و سەرانە زۆرەکانیو چاوچنۆکی سەردارەکانیو بەربەستە بازرگانییەکانی، ماندووی کردبوون. سەرکردە نیشتمانییەکان توانیان بە شێوەی یەك لە دوای یەك ویلایەتەکانی (چیلی، ئەرژەنتین، فەنزوێلا، کۆلۆمبیا) لەژێر دەستی ئیسپانیا دەربهێنن.

لەو سەروبەندەدا حکومەتی ئیسپانیا لە فلۆریدا ساڵی (١٨١٩) کەمکێشی بۆ ولاَتە یەکگرتووەکان کرد، لە هەمان کاتیشدا کۆماری یەکێتی چاودێری پەرەسەندنی بزووتنەوەی سەربەخۆیخوازانەی نشینگەکانی باشووری دەکردو چاوی خستبووە سەر.

وڵاتــە یــەکگرتووەکان دەیویــست لــە یەکــەم هەلــدا دان بــە ســەربەخۆیی ویلایەتەکانی ئەمریکای باشوور بنێت. زۆر زوو چاوتێبڕینەکانی وڵاتان بزواو رووسـیا داوای ناوچەکانی باشووری نشینگەکانی لە "ئالاسکا"دا دەکرد، یان لە لایەکی دیکە رووسیاو پرووسیاو نەمساو فەرەنسا پەیمانیان دابوو بەپێی "هاوپەیمانێتی پیرۆز"ی نێوانیان (پاشا شەرعییەکانی) ئەو وڵاتانە بگێڕنەوە، کە "ناپلیۆن" دەری کردبــوون. بۆیــە ئیــسپانیا داوای لــەو وڵاتانــە کــرد هاوکــاری بکــەن بــۆ توندوتۆڵکردنەوەی دەسەڵاتی لە نشینگەکانی لە ئەمریکای باخیبوو. هاوهەنگاو سەرۆك کۆمار "مۆنرۆ" (James Monroe) لە (٤ی مارتی ساڵی ١٨٢٢)دا دەستپێشخەری کرد لە دانان بە سەربەخۆیی کۆمارەکانی ئەمریکای باشوور.

ئینگلتــەرە بــە چــاوی رەزامەنــدی لــە دەســتێوەردانی ئــەوروپا لــە کاروبــاری ئەمریکای باشوور نەدەڕوانی، چونکە جیابوونەوەی ئەو ویلایەتانە لە ئیسپانیا لە ئاکامی تێکشکانی کۆتو پێوەندە بازرگانییەکانو زۆربوونی بزاوتی بازرگانی بوو لە نێوان ئەوانو ئینگلتەرەدا.

سەرۆك وەزیرانی ئینگلیزی "کاننگ" پێشنیاری ئەوەی بۆ وەزیری ئەمریکا کرد کە ئینگلتەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان هاوکاری یەکتر بن لە رێگەگرتن لە دەستێوەردانی دەوڵەتانی هاوپەیمان. بەڵام سیاسەتوانە ئەمریکییەکان وایان بە باش بینی بۆ خۆیان و دەرەنجامێکی دروست تـرە کـە وڵاتـە یـەکگرتووەکان بـە تــەنها ئــەرکی پاراســتنی کۆمارەکــانی ئــەمریکی بگرێتــە ئەســتۆ. ئیــدی لــەو بەرەنجامــەدا "مــۆنرۆ" لــە کــۆنگرێس (٧ی کــانوونی یەکــەمی ســاڵی ١٨٢٣) روونکردنەوەی خۆی، ناسراو بە "پرەنسیپی مۆنرۆ" پێشکەشکرد، کە تیایدا

پلانـی سیاسـیی ولاتـە یـەکگرتووەکانی بەرامبـەر بـە هەرێمـەکانی کیـشوەری ئەمریکی کێشاوە.

لەو لێدوانەدا هاتووە کە:

**"بۆ هیچ دەوڵەتێکی ئەورووپی نییـە لـە ناوچـەکانی دۆڵـی رۆژئـاوادا نـشینگە دامەزرێنێت".**

ئەوەش ئاماژەی تێدایە بۆ چاوتێبڕینەکانی رووسـیا لـە کـەنارەکانی زەریـای هێمن و فەرەنسا لە ولاتی مەکسیك.

لێدوانەکە ئەوەشی راگەیاند کە:

**"ولاتە یەکگرتووەکان بڕیاری داوە خۆی لە کاروباری سیاسیی ئەورووپی یـان لە موڵکەکانی دەوڵـەتانی ئـەورووپی لـە جیهـانی نـوێ هەڵنـەقورتێنی، بـەلام لـە بەرامبەریشدا داوایان لێ دەکات رێگری لە سـەربەخۆیی کۆمارەکـانی ئـەمریکای باشوور یان سیـستەمە ناوخۆییـەکانیان نەکـەن کـە ولاتـە یـەکگرتووەکان دانـی پێداناوە، هەر دەستێوەردانێکیش لە کاروباری ئەوانە بە کارێکی دوژمنکارانە دژ بە ولاتە یەکگرتووەکان دەژمێردرێت".**

ئـەم پرەنـسیپە لـە رووکەشـدا مەبەسـتی پاراسـتنی کۆمارەکـانی ئـەمریکای باشوورو ناوەراستە لە دەسـتێوەردانی ئـەورووپی و بەرگرییـە لـە سـەربەخۆییان و سیستەمە کۆمارییەکانیان، کەچی لە راستیدا پاوانکردنی ناوچەی دەسـەلات بـوو بۆ ولاتە یەکگرتووەکان لە هەموو ولاتانی کیشوەری ئـەمریکی. بۆیـە زۆرجـار بـە بیانووی رێگەگرتن لە دەوڵەتێك یـان چـەند دەوڵـەتێکی ئـەورووپیی دیـاریکراو لـە

داگیرکـردن‌و دەسـتدرێژکردنە سـەریان دەسـت بەسـەر ناوچـەکاندا گـیراوەو لکێندراوە بە ولاتە یەکگرتووەکانەوە.

پیـادەکردنی "پرەنسیپی مـۆنرۆ"و فراوانبـوون لـە پیـادەکردنی لـە نیـوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بوو: لـە مەکسیك (١٨٦٦)، ئالاسـکا (١٨٩٧)، کوبـا (١٨٩٨). ولاتـە یـەکگرتووەکان سـالّی (١٨٦٥) نـارەزایی بەرامبـەر بـە شـالاوی "نـاپلیۆن" بـۆ سـەر ولاتـی مەکسیك دەربـڕی، بۆیـە سـالّی (١٨٦٦) سـوپای کشاندەوە، هەروەها سالّی (١٨٦٧) ئالاسکای لە رووسیا کڕیەوە.

هەرچـی دوورگـەی کوبـا "شـاژنی ئـەنتلس"و گـەورەترین و دەولّەمەنـدترین دوورگەکانی بە تووتن‌و شەکرو کانزاکانی بوو، ئەمریکییەکان لەمێـژ بـوو چـاویان تێبڕیبـوو. کـاتێکیش ئیـدارەی ئیـسپانی لـە کوبـا و پۆرتۆریکـۆ (ئـەنتلس لـە ئەمریکا)و لە دوورگەی فیلیپین (لە ئاسیا)دا خراپ‌و ستەمکار بوو تەنها بـیری لـە قۆزتنەوەی ئەو نشینگانە دەکردەوەو لـە پێنـاو بەرژەوەنـدیی دەولّـەتی خـاوەن سەروەری (واتە ئیسپانیا) رێگری لە بەردەم بەرژەوەندییەکانی دانیـشتوانی ئـەو ناوچـانە دەکـرد، لـە مـاوەی سـەدەی نۆزدەهـەم‌و لـە کـات و سـاتی جیـاوازدا شۆڕشیان دژی بەرپاکرد.

شۆڕش لە کوبـا سـالّی (١٨٩٥) بلاوبـۆوە، لـە فیلیـپین سـالّی (١٨٩٦)، زۆری نەمابوو سالّی (١٨٩٧) جەنگ بە بەخشینی سـەربەخۆیی نـاوخۆیی کۆتـایی بێـت لـەو دوورگانـە، کەچـی ولاتـە یـەکگرتووەکان لـە ئاکـامی تەقینـەوەو نغرۆبـوونی کەشـتییەکی لـە ئاوەکـانی کوبـا سـالّی (١٨٩٨) خـۆی لـە جـەنگ هەلقورتانـد، بەوەش جەنگ لە نێوان ئیسپانیاو ولاتە یەکگرتووەکان بەرپابوو. جەنگ نزیکـەی

سێ مانگی خایاند، کە لەمیانەیەدا هێزە دەریاییەکانی ئیسپانی تێکشکێنران و ئیسپانیا ناچاربوو بە گوێرەی "پەیماننامەی پاریس"، لە (١٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٨) دەست لە دوا نشینگەکانی خۆی هەڵگرێت.

ئیسپانیا کەمکێشی لە پۆرتۆریکۆ و فیلیپین بۆ ولاتە یەکگرتوەکان کرد بەرامبەر بە پێنج ملیۆن دۆلار (یەك ملیۆن جونەی). کوباش سەربەخۆیی پێدرا، بەڵام ولاتە یەکگرتووەکان دەستی بەسەردا گرت. لەو رێگەیەشەوە توانی کۆنترۆڵی کەنداوی مەکسیك و دەریای ئەنتلس بکات، یان بە گوزارشتێکی دیکە بووە خاوەنی کلیلەکانی دەریای سپی ئەمریکی.

لە ئاسیاشدا بە دەستخستنی فیلیپین، ناوچەیەکی دەسەڵاتی جیهانی لە نێوان ژاپۆن و چین هیندی چینی، لە یەکێك لە مەمەڕەکانی سەنگافورە بۆ ولاتە یەکگرتوەکان دروستکرد. لەو کاتەشەوە ولاتە یەکگرتوەکان کار بۆ ئەوە دەکات سایەی خۆی بەسەر زەریای هێمندا بسەپێنێت. ئەوەش خاڵی ناکۆکی و ململانێ بوو لە نێوان ولاتە یەکگرتوەکان و ژاپۆن و چوونە پاڵی ئەو ولاتە بۆ ئینگلتەرە، کە بیری لە دروستکردنی بنکەیەکی سەربازیی بەهێز دەکردەوە لە سەنگافورە.

لە ساڵی (١٨٩٣)دا ولاتە یەکگرتووەکان "دوورگەکانی هاوای"یان داگیرکرد، کە گرنگترین خاڵی سەربازییە لە زەریای هێمن. بەوەش ولاتە یەکگرتووەکان بووە خاوەنی وێستگەیەکی دەریایی سەخت لە بەندەری (پیرل هاربەر).

---

(١) مێژووی نووسینی ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی زووتر. بۆیە پێویستە خوێنەری بەڕێز ئاگاداری ئەوە بێت کە کاتێك نووسەر باس لە ڕەوشی ولاتە یەکگرتووەکان دەکات ئەوا لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووەو مێژووی کۆمەلایەتی‌و پێکەوە ژیانی دانیشتوانی ئەو ولاتە قۆناغی کاریگەری بڕیوە، ئەو زولم و زۆردارییەی دەرهەق بە ڕەش پێستەکان دەکرا ئێستا زۆر کەمبۆتەوە. (وەرگێڕ)

# چاوپێکەوتن لەگەڵ مێژوونووس د.ئامانج حسن أحمد

ئەنجامدانی: د.محمد عبدالله کاکە سوور

پ١/ ناونی/٠٥٨١/شانی نامەی ماستەرت چییە؟

و/ برایم ئەحمەد ڕۆڵی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا.

پ٢/ ناونیشانی نامەی دکتۆرات چییە؟

و/ پەیوەندی نێوان کوردو ئاسوری(١٨٤٣-١٩٣٣ز).

پ٣/ ناوی تەواوی ڕێککەوت و شوێنی لەدایك بوونت؟

و/ ئامانج حسن ئەحمەد، سلێمانی ١٩٧٩.

پ٤/ چەند وڵاتت بینیوە؟

و/ ئێران، سوریا، تورکیا.

پ٥/ چەند زمان دەزانی؟

و/ کوردی، عارەبی، فارسی، تاڕادەیەك ئینگلیزی.

پ٦/ بۆچی لە نێوان مەسیحییەکانی کوردستان مێژوونووسی ئەکادیمی هەڵنەکەوتوون؟

و/ ناکرێت بڵێین مێژوونووس لە نێو مەسیحییەکاندا هەڵنەکەوتوون، بەڵام دەکرێت بڵێین زۆر دیارو بەرچاونین کە ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کەمینەن لە کوردستاندا.

پ٧/ بازاڕی کتێبی مێژوویی لە کوردستاندا چۆن دەبینی؟

و/ لەم ساڵانەی دوایدا بەرەو پێشەوەچونێکی زۆری بەخۆوە بینیوە.

پ٨/ بۆچی ئەگەر ئافرەت مافی خوێندنی لە کوردستاندا هەیە بەشداری ئافرەت لە نووسینی مێژووی کورددا لاوازە؟

و/ ئافرەت لە کورستاندا، خۆیان ناتوانن کار بۆ خۆیان بکەن و تواناکانی خۆیان دەربخەن، گەرنا باوەڕ ناکەم ڕێگرییەك هەبێت لە بەردەمیاندا، جگە لەوەش مەرج نییە هەر کەسێك خوێندەواربێت ببێتە مێژوونووس.

پ٩/ ئایا سەردانی مۆزەخانەکانی کوردستانت کردووە؟

و/ بە دڵنیاییەوە، مۆزەخانەکانی (سلێمانی، هەولێر، دهۆك، سنەو هەمەدان...)م بینیوە.

پ١٠/ لەکاتی خوێندنەوەی مێژووی کورد هەست بە چی دەکەی شانازی کردن یان غەمباربوون یان هەست دەکەی کاری خۆت دەکەی؟

و/ لە ڕاستیدا خوێندنەوەی مێژووی کورد وام لێدەکات کە نیگەران بم، ئەویش لە لایەکەوە بۆ سیاسەتی داگیرکەرانەی وڵاتانی هەرێمی و نێودەوڵەتی دەگەڕێتەوەو لە لایەکی دیکەوە ململانێ و شەڕو پێکدادانی نێوخۆیی و یەکتر قەبوڵ نەکردن و خیانەت و... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مێژوویەکمان هەیە کە مایەی خۆشحاڵی و شانازی بێت.

پ١١/ پێت وایە ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆی کوردستان سەرچاوەیەکی باش بێت بۆ مێژوونووس لە ئایندەدا پشتی پێ ببەستێ بۆ نووسینی مێژووی کورد؟

و/ بەڵێ، لەبەر ئەوەی باوەڕناکەم ئەرشیفێکی نەتەوەیی باشمان هەبێت.

پ١٢/ پێت وایە شتێك هەبێت بە ناوی قوتابخانەی کوردی لە نووسینی مێژوودا؟

و/ بەداخەوە نییە گەر ویستێکیش هەبێت زۆر لاوازە.

پ١٣/ بایەخی وێنە لە بواری مێژوودا چییە؟

و/ زۆر گرنگە.

پ١٤/ پێت وایە جیاوازی هەبێت لە نێوان زمانی نووسینی مێژوویی و زمانی نووسینی ئەدەبیدا؟

و/ بەڵێ.

پ١٥/ ڕات چییە بەرامبەر بە مێژووی زارەکی ئایا لەم بوارەدا کارت کردووە؟

و/ یەکێك لە سەرچاوەکان کە توێژەر کاری لەسەر دەکات وەرگرتنی زانیارییە لە لایەن کەسانی شارەزا لە بوارێکی دیاریکراودا هەر بۆیە تاڕادەیەك گرنگی پێدەدەم.

پ١٦/ پێت وایە مێژوونووسی بێ لایەن هەبێت؟

و/ سەبارەت بە مێژوونووسی بێ لایەن دەکرێت بڵێین کە لە وڵاتانی ڕۆژئاواو پێشکەوتوودا بوونی هەیە و نووسەران لەبەر ئەوەی کە هیچ منەت و باکیان بە دەستەڵاتداران نییە بە ئازادی و بەبێ ترس بۆچوونی خۆیان ڕادەگەیەنن، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا ناڵێین نییە، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر لایەنداری و کەوتنە ژێرباری تێدایە.

پ١٧/ مێژوو هەر سوودی هەیە یان زیانیشی هەیە؟

و/ ئێمە نابێت لە سوودو زیانەکانی بپرسین بەڵکو دەبێت خۆی چۆنە وەها باسی بکەین، چونکە بە چاك و خراپییەوە مێژوو ڕوویداوە و دەربازبوونی نییە، ئێمەش خۆمانی لێبدزینەوە و باسی نەکەین ئەوا کەسانی دیکە ڕاستییەکان دەخەنەڕوو.

پ١٨/ پێت وایە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی کوردستان وەکو پێویست گرنگیان بە بواری مێژوو داوە؟

و/ تاڕادەیەك.

پ١٩/ وێنەی هیچ کەسایەتییەکی مێژووییت لە ماڵەوە هەڵواسیوە؟

و/ نەخێر، وێنەی کەسم لە ماڵەوە هەڵنەواسیوە.

پ٢٠/ چۆنە بایەخی وەرگێڕان لە بواری مێژوودا دەبینی؟

و/ وەرگێڕان لە هەموو بوارێکدا بە گرنگ دەزانم بەتایبەتی بۆ بەشی مێژوو چونکە بە ڕاستی کتێبخانەی کوردیمان لاوازەو فێرخوازانیشمان لە کوردی بەولاوە هیچ زمانێکی دیکە نازانن.

پ٢١/ لەگەڵ ئەوەی مۆزەخانەی ئەهلی لە کوردستاندا بکرێتەوە؟

و/ گرنگ نییە بەلامەوە هەبێت یان نەبێت.

پ٢٢/ بۆ پتر خزمەتکردنی مێژووی کورد پێشنیاری چی دەکەی؟
و/ بۆ خزمەتکردنی لایەنی مێژوویی پێویستە ڕەچاوی چەند خاڵێك بکرێت:
١- دەرخستنی سەرجەم بەڵگەنامەکان.
٢- زەمینە خۆشکردن بۆ توێژەران.
٣- دابینکردنی گەشت و ڕاهێنانی مامۆستایانی زانکۆ لەسەر زمانی ئینگلیزی.
پ٢٣/ ئایا مێژوونووسانی کورد لەبەر پوخت نووسی یان لەبەر کەم کاتی کەم دەنووسن؟
و/ بەشێکی زۆریان ئارەزووی نووسینیان نییەو خۆیان لە کێشەو گرفت بەدووردەگرن.
پ٢٤/ لە هیچ نووسینێکی خۆت پەشیمانی؟
و/ تارادەیەك.
پ٢٥/ ئایا دراوسێکانی کورد هەر مێژووی کوردیان چەواشەکردووە یان خزمەتیشیان کردووە؟
و/ هەردوو لایەنەکەی تیادایە.
پ٢٦/ چۆن وەڵامی ئەو کەسانە دەدەیتەوە کە مێژوو بەدرۆ دەزانن؟
و/ ئەوانەی مێژوو بەدرۆ دەزانن لە بایەخی مێژوو نەگەیشتوون.
پ٢٧/ لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانی مێژوو کامەیان بەگونجاوتر دەزانی؟
و/ مێژوو بریتییە لە تۆماری ڕووداوەکانی ڕابردوو بە مەبەستی سوود وەرگرتن بۆ ئێستاو دانانی بەرنامەو پلانێکی گونجاو بۆ دوارۆژ.
پ٢٨/ ئایا دایك و باوکت خوێندەواربوون؟
و/ بەڵێ.
پ٢٩/ ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەی ماڵەوەت چەندە؟
و/ نزیکەی (١٥٠٠)کتێب.

# چەند سەرە دێڕێکی فەلسەفەی مێژوو

قارەمان نادر شێخ بزێنی

## یەك : دروستکەری مێژوو

بۆچوونی جۆراو جۆر هەیە سەبارەت بەوەی، کێ خاوەنی مێژووە، یاخود کێ دروستکەر و بەڕێوەبەری مێژووە و زەمینەسازی دەکات بۆ تۆمار کردنی ڕوداوەکان و ئاراستە کردنی ئەو ڕوداوانە بە ئیجابی و سلبییەوە کۆمەڵگایان گەیاندۆتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ ، یەکێ لەو بۆچونانە پێی وایە خاوەنی ڕاستەقینەی مێژوو گەلە و هەرگەلیش دەتوانێ شانۆی ڕوداوەکان دروست بکات، چونکە ڕەوڕەوەی مێژوو زۆر گەورەیە و بە تاکە کەسێك هەرگیز پاڵ نانرێت و جوڵە ناکات و بەرەو پێشەوە ناڕوات یاخود دەتوانین بلێین ناسورێتەوە ،چونکە ڕەوڕەوەی مێژوو لەوانەیە بە پێچەوانەشەوە بگەڕێتەوە.

بۆیە پاڵنەری ئەم ڕەوڕەوەیە هەر کۆمەڵگایە بە چاك و خراپیەوە ئەرکی گەورەی لە سەر شانە بۆ بەڕێوەبردنی ڕوداوی مێژووی و کەرەسەی شەڕەکان و بە سەرهاتەکانی، هەردەم گەلە دەبێتە سوتەمەنی ئاگری شەڕەکان، هەرچەندە لە لایەن چینێکی کەمەوە یان دەستەیەکەوە شەڕەکان هەلدەگیرسێندرێت(١)، سەرەڕایی ئەوەی سەرکردە دیار و ناودارەکان ڕۆڵی گرینگیان گێڕاوە لە سەرپەرشتی کردنی ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکان و زۆرجار بونەتە هۆی دیار

کردنی رێڕەوی رەوتی مێژوو و ئاراستە کردنی رەوتەکە بە ئاقاری ویستەکانی خۆی دا بردووە، بەڵام ژێر خان و خاوەنی راستەقینەی دروستکەری مێژوو گەلە.

بۆ نمونە ناپلیون لە دوای شۆرشی فەرەنسا رۆڵی گەورە و دیاری بینیوە لە هاتنە پێشەوەی رووداوەکانی ئەو سەردەمە بەلام ئەگەر رێژەی زۆری خەڵکی گشتی (*)، نەبوایە و بێسنور بێزار بوون لەو نالەباری و پاشاگەردانیەی کە ئەو کاتە فەرەنسای دوای شۆرشی گرتبۆوە، زەمینە سازیکرد بۆ دەرکەوتن و هاتنەپێشەوەی کەسێکی سەربازی توند و تیژ و تاکرەوی وەك ناپلیونی پێویست بوو بۆ دەرباز بوونی فەرنسا لەو قەیرانە ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەی کە سەرجەم چینەکان پێوەیان دەناڵاند(٢) ،پێموایە ئەگەر ناپلیون پۆناپارتیش نەبوایە ئەو زەمینەیە کاراکتەرێکی تری بە ناونیشانێکی تر لە هەمان ژینگەدا دروست دەکرد، لە پێناو رزگارکردنی کۆمەڵگای فەرەنسی لەو قەیرانە، ئەو کاراکتەرەش بە سود وەرگرتن لە خەڵکی ولات و خوێندنەوەی زەمینەی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی ئەو سەردەمە و ئاراستە کردنی خەڵکەکە بەرەو رزگاری نەتەوەیی و نیشتیمانی .(٣)

بەلگەش بۆ ئەمە چەندین بزوتنەوەی بێ سەرپەرشتیاری سەریان هەڵداوە بە شێوەی رەمەکی(عشوائی) رووداوەکان رویان داوە بێ ئەوەی سەرکردەیەکی دیار و ناسراو خاوەن دیسپلین و پرنسیپی رێکخراو خاوەن ئەزمون ، بەڵکو لە ئەنجامی کەڵەکەبونی رقی خەڵك لە چەوسانەوەی بێشوماری زۆرداران و دەسەلاتی حوکمرانی، کاری کردۆتە سەر ورژاندنی ئایدۆلۆژیەتی خەڵك و هەلوێستی دژیان نواندووە، بە مەبەستی رزگار بون لەو بارە سەختەی بە سەریاندا هاتووە، یەکێ لەو نمونە دیارەکانیش ئەو راپەرین و شۆرشانەی جیهانی عەرەبی بوو، کە بە بەهاری عەرەبی ناسران، ئەمەش دەرئەنجامی کەڵکە

بوونی قەیرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری هاتنە بوون، بێ ئەوەی هیچ کاراکتەرێکی سەرەکی دەرکەوێت، ڕۆڵی کاریزمی ببینێ لە سەرهەڵدان و سەرپەرشتی ڕووداوەکاندا(٤).

یا خود ڕاپەرینەکانی جەماوەری ڕوسیا بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر، هەرچەندە بەلشەفیەکان سەرپەرشتیان دەکرد، بەلاّ م زۆربەی ڕاپەڕینەکان بێ سەرپەرشتیاری کردن لە ناکاو لە ئەنجامی نارەزای جەماوەر ڕویان دەدا ، دژەکانی قەیسەریش سودیان لەو نارەزایانە وەردەگرت.

بەلاّم بۆچونێکی تر هەیە کە پێی وایە سەرکردەکانن ڕۆڵی سەرەکیان گێڕاوە لە خاوەندارێتی مێژوو و کۆکردنەوە و ئاراستە کردن و دارشتنی پلانی ستراتیژی و زەق کردنەوەی خاڵە لاوازەکانی دژەکان و وروژاندن و وشیارکردنەوەی ڕای گشتی خەڵك لەو کارە قێزەونانەی کە سیستەمی حوکمرانی ئەنجامی دەدات ، بۆ ئەم مەبەستەش سەردەکان پێویستیان بە زەمینە و هەل و ژینگەیەك هەیە بۆ ئەوەی بیقۆزیتەوە ورۆڵی ڕاستەقینەی خۆی ببینێت ، هەروەها ناکرێت بڵێن پێش ناپلیۆن هیچ ئەفسەرێکی تر نەبووە کە سەرجەم ڕوحیەتی سەرکردەی تیا نەبووە بەلاّم زەمینەیەی کە ناپلیۆنی تیادا دروست بوو گەیشتبووە ترۆپك بۆ گۆڕانکاری ڕیشەی لە بواری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیدا.(٥) ، بەلاّم ئەو زەمینەیە پێشوتر گونجاو نەبووە.

بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوونە (جەمالەددین ئەفغانی) لای وایە ((ئەگەر جوتیاران شوانکارەکان نەبوایە تەخشان و پەخشان و رابواردنی دەوڵەمەندەکان نەدەبون ، جێگەی جوتیار و سەنعەتکار لە شارستانیەتدا لە پێگەی میران بە کەڵکترە ، هەروەها دەڵێت دیومانە گەلێك بێ پاشا بژیت بەلاّم نەمان دیوە پاشایەك بێ گەل بژیت))(٦)

بەڵام تۆماس کارلاین (١٧٩٥–١٨٨١) پێچەوانەی جەمالەددین ئەفغانی بە شان و باڵی سەرکردکاندا هەڵدەدات و پەخشان ئامێزانە رۆڵی گرینگیان هەڵدەسەنگێنێ بە پاڵنەری راستەقینەی رەورەوەی مێژووی ناو دەبات(٧).

هەڵبەتە ئەم گفتو گۆ و رای جیاواز سەبارەت بە کێ خاوەنی راستەقینەی مێژووە بەردەوامی هەیە و بەردەوامیش دەبێت، بەڵام پێموایە هەردوو بۆچوون(سەرکردە و گەل)، بۆ رووداوی مێژووی و بەرێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی رواداوە مێژوویەکان گرینگن. راپەرینەکان پێویستیان بە گەلێك هەیە بۆ دروست بوونی و سەرکردەیەکیش بۆ رابەرایەتی کردنی رووداوەکان و دیاریکردنی پلان بۆ پێشهاتەکان.

## دووەم: دووبارەبوونەوەی مێژوو

تاقیکردنەوەکانی مێژووی هەزار ساڵەی ئادەمیزاد ئەوە دەسەلمێنن کە کۆمەل بە پێی یاسایەکی تایبەتی دەگۆرێت و بەرەو پێشەوە دەچێت ، ئەو یاسایەش بۆ خۆی کەوتۆتە ژێر کاری ژمارەیەك دیاردەی گرینگی پێکەوە بەستراوی خودی ژیانەوە ، وەك باری ئابوری (پەیوەندی و هۆکانی بەرهەم هێنانی و دەور و بەرو شوێنی جوگرافی و داب و نەریتی کۆمەلایەتی و ئاستی تێگەیشتن و دەزگاکانی حکومەت و زۆر و کەمی ژمارەی دانیشتوان و رادەی پەرەسەندنیان و پێوەندی یان لە گەل دار و دراوسێدا و ئەو جۆرە بابەتانە کاریگەری راستەوخۆیان لە سەر دروست بوونی روداوەکان هەبووە ).(٨)

دوبارەکردنەوەی مێژوو وەکو سەرجەم زانستەکانی تر ناکرێت بلێین دەقا و دەق دووبارە بێتەوە ، چونکە سەرجەم ئەو فاکتەرانەی کە کار لە دروست بوونی روداوی مێژووی دەکەن چ زانستی مجرد یان زانستی سروشتی و جیولۆجی لە ژێر

کارگەری جوگرافیا و هێزەکانی سروشتدان ، فاکتەری دروست بونی مێژووی مرۆڤایەتی کاراکتەرەکەی مرۆڤە و ئەمیش خاوەنی هەست و هۆشە و گەلێك هۆکار کاریگەری لە سەر دروست دەکات، بە ڕاست چەپدا دەیبەن، یان پەکی دەخات(٩) .

لە گەل ئەوەشدا ڕوداوی مێژووی لە سنورێکی دیاری کراودا خۆی دوپات دەکاتەوە ، فاکتەر و هۆکاری ڕوداوەکان زۆربەی کات لێکتر نزیك بوون، یا خود هەمەچەشنن لە هەڵایسانی شەڕ و شۆرش و بزوتنەوەکان ، بۆ نمونە شۆڕشە بۆرژوازییەکانی ئەوروپای نێوان سەدەکانی شازدە و نۆزدە لە زۆر ڕووەوە لە یەکتر دەچن ،چ لە هۆلەندا و چ لە ئینگلتراو چ لە فەرەنسا و ولآتانی تری ئەوروپایی ئەو قۆناغە زۆرداری و هەرەس هێنانی پێوەندی دەرەبەگی و پەیدا بونی چین و دەستەی نوێ و بەرز بونەوەی ڕادەی تێگەیشتنی کۆمەلآنی خەڵك و باری قورسی ژیانی ئابوری و چەند هۆیەکی لە یەك چوی تر ، وەك هۆکارەکانی دروست بونی شۆرشی ئەفسەرە ئازادی خوازەکانی میسر لە سالی ١٩٥٢ بە سەرکردایەتی (جەمال عەبدولناسر) و شۆرشی ١٩٥٨ لە عیراق بە سەرکردایەتی (عەبدولکریم قاسم) لێکچونی زۆر لە نیوانیاندا هەبوون چ لە دروست شۆڕش لە لایەن ئەفسەرەکانەوە یان ڕوخانی رژێمی پاشایەتی و ڕاگەیاندنی سیستەمی کۆماری لە ولآتدا و شێوازی حوکمڕانی و زاڵبونی سیستەمی سەربازی بە سەر ئیدارە و بەڕێوەبردن دا لێك نزیکی زۆر لەو نێوان ئەو دوو ولآتەدا هەبووە.(١٠)

هەر چەندە نێوان ڕوداوەکان چەندین ساڵ یان چەند سەدە لە نێوانیان دا بووە، بەلآم مێژوو خۆی دوبارە کردۆتەوە بەلآم لە کاتی جوداو لە شوێنی جوداو کاراکتەری جودا .

## سێیەم : مێژووی فەلسەفەی مێژوو

دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت مێژوو زانستی زانستەکانە چونکە هیچ زانستێك یان شوێنەوارێك یان روداوێك نیە مێژووی سەرهەڵدانی یاخود سەرگوزشتە و بە سەرهاتی روداوەکانی نەبێت ، بۆیە فەلسەفەی مێژووش مێژووی خۆی هەیە ، هەرچەندە رای جیاواز هەیە لە سەر سەرهەلدانی فەلسەفەی مێژوو ، زۆربەی بۆچوونەکان لایان وایە کە سەرەتای ئەم تێزە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوفی فەرەنسی (ڤۆلتێر) کە بۆ یەکەم جار ئەم دەستەواژەیەی بەکار هێناوە بە مەبەستی شیکردنەوەو لێکۆلینەوە و بە دوا داچونی راستیە مێژوویەکان بە شێوەیەك کە لە گەل ئەقلّ و مەنتیقدا بگونجیّ و هەلاوێر بکرێت ، لە ئەفسانە چیرۆك و زیادەرۆیەکان پاك بکرێتەوە و سەرجەم راستیەکان تیایدا بپالێورێت و خەڵکی بە راستیەکان ئاشنا بکرێت و لە گومان و ڕاڕایی جودا بکرێتەوە(١١).

هەرروەها (ئیبن خەلدون) یش وەکو ڕابەری بە کار هێنان و توێژینەوەی ئەم باسە هەژمار دەکرێت ولای وایە کە فەلسەفەی مێژوو پاککردنەوەیە لە ناوەرۆك و لایەنی ئاشکرای، لایەنی ئاشکرای تێکڕای روداوەکانن و هەواڵەکانی وڵاتان و جیهانە کە لە سەردەمەکانی ڕابردوودا ڕویان داوە و بیّ کەم و زیاد ، بەڵام چینی ناوەوەی ڕوداوەکان واتە شیکردنەوەو دەرهێنانی هۆکاری ڕاستەقینەی ڕوداوەکان و دۆزینەوەی بنچینە و بنەمای ڕاستی هەواڵەکان، ئەمەشی بە کاری ڕاستەقینەی مێژوو نوس داناوە(١٢).

لێرەوە مێژووی فەلسەفەی مێژوو سەرهەلدەدات و دەبێتە بابەتێکی سەربەخۆ و خودان میتۆد و ئامانجی خۆی دەبێت، پاشان لە بلاّو کراوەو کتێبەکاندا بووە بابەتێکی گرنگ لای فەیلەسوفان هەروەکو لە کتێبەکەی هێردەردا (بیرۆکەی مێژووی فەلسەفی بۆ مرۆڤایەتی ) لە سەدەی هەژدەدا بلاو

بوەوە ، هەروەها پەرتوکەکەی هیگل ١٧٧٠- ١٨٣١(چەند لێکچەرێك لە بارەی فەلسەفەوە) پاشان ئەم تێزە گەشەی کرد و لە نوسینەکانی رۆشنفکرەکاندا بە تایبەتی مارکس و شپینگلەر و تۆینبی .....

هەرچەندە هەندێك بۆچون هەیە کە دەڵێت لە سەردەمی یۆنانیە کۆنەکاندا فەلسەفە بابەتێکی گرینگ و جێگەی مشت و مر بووەبە تایبەتی لە سەردەمی ئەفلاتون و ئەرستۆ و سەفستایەکاندا.(١٢).

پێم وایە هەرچەندە فەلسەفە لە سەردەمی یۆنانیەکادنا بوونی هەبووە و مشت و مڕی زۆری لە سەر بابەتە فکریەکان کراوە، بەلآم خاوەن میتۆدێکی تایبەتی نەبووە

## سەرچاوەکان


١-کەمال مەزهەر ئەحمەد:مێژوو،بەغداد،١٩٨٣،ل١٤

*-خەلکی گشتی بەمەبەستی چینی سێیەم کەچینە هەژارەکەی خەلکی دەگرتەوە ، لە سەرجەم امتیازەکان بێبەش بوون تەنیا سەرباز و باج دان سودیان لێ وەردەگیرا(عبدالحمید البطریق و عبدالعزیز نوار : تاریخ الحدیث، بیروت، ص٣٢٩.

٢-کەمال مەزهەر:س.پ،ل١٥.

٣-احمد محمود صبحي:في الفلسفة التاریخ،بیروت،ص٦٤.

٤-کەمال مەزهەر : س.پ،ل١٥.

٥-ئی.ئێچ.کار:مێژوو چیە،چاپی یەکەم،٢٠٠٥،ل٣٧-٣٨.

٦-کەمال مەزهەر : س.پ،ل١٦-١٧.

٧–هاشم يحى الملاح و اخرون:دراسات فى الفلسەفە التاريخ،الموصل،ص١١٩.

٨–شاخەوان فايق ئەلياس:مەعريفەی مێژوو،سلێمانی،٢٠٠٩،ل٦١–٦٢

٩–شاخەوان فايق ئەلياس :س.پ،ل٦٤.، د.جفعر علي رسول:مفهوم التاريخ و الفلسفة و العلاعة بينها،كۆڤاری زانكۆی كۆيە،ژمارە ١٢، ٢٠٠٩، ٢٠٥.

١٠–كەمال مەزهەر،س.پ،ل٩.

١١–ئی.ئێچ.كار:س.پ،ل٩٨.

١٢–كەمال مەزهەر:س.پ،ل٧.

١٣–مصطفي النشار:فلسفة التاريخ،ط١،٢٠٠٤،ص٦٦.، د.احمدعبدالعزيز: الفلسفة (اهية فلسفة ام تاريخ)، گۆڤاری مێژوو،ذمارة٧،هاوينی ٢٠٠٨،ص٣ ،مصطفي النشار،ن.م،ص٣٣.

# چاوپێکەوتن لەگەڵ مێژوونووس زریان سالار حەمە عارف

ئەنجامدانی: د. محمد عبدالله

پ١/ ناونیشانی نامەی ماستەرت چییە؟

و/ ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە نێو شارستانیەتی ئیسلامیدا لە سەردەمی عەبباسی یەکەم دا(١٢٢-٢٢٢).

پ٢/ ناونیشانی نامەی دکتۆرات چییە؟

و/ ڕۆڵی ڕەگەزی ئێرانی لە پێشخستنی شارستانیەتی ئیسلامیدا لە چوار سەدەی یەکەمی کۆچیدا.

پ٣/ ناوی تەواو و ڕێککەوت و شوێنی لەدایك بوونت؟

و/ زریان سالار حەمە عارف لە دایکبووی ساڵی ١٩٨٣-سلێمانی.

پ٤/ چەند وڵاتت بینیوە؟

و/ وڵاتی ئێران.. ئەمە جگە لە بینینی تەواوی ناوچەکانی باشووری کوردستان و عێراق بە گشتی.

پ٥/ چەند زمان دەزانی؟

و/ کوردی و عارەبی نووسین و خوێندنەوە... و ئینگلیزی فارسی خوێندنەوە.

پ٦/ بۆچی لە نێوان مەسیحییەکانی کوردستان مێژوونووسی ئەکادیمی هەڵنەکەوتوون؟

و/ من پێم وانییە کە مێژوونووسی ئەکادیمیی نەبێت، چونکە لە ڕاستیدا ئەگەر مێژوونووسی ئەکادیمی بەو واتایە بێت کە بەشی مێژووی تەواوکردبێت ئەو کات بنووسێت ئەوا ڕەنگە ڕاست بێت هەرچەندە بۆ ئەمەش کەسی ئەکادیمی هەیە بۆ نموونە لە زانکۆی دهۆك کەسایەتی هەیە دەرچووی ماستەرو دکتۆرایە، ئەمە جگە لەوەی کەسایەتی ترمان هەیە کە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لە نێو مەسیحییەکاندا هەبوون لەوانە یعقوب الرهاويو ...هتد لە چەرخی نوێش نووسینەکانی جرجيس فتح الله و د.ئەلبێرت عیسا هەیە کە دیسان نووسینی ئەکادیمی هەیە لە بواری خۆیدا، ئەتوانین پرسیارەکە وەها لێبکەین بڵێین هۆکاری زۆر دیار نەبوونی ئەو کەمینەیە چییە لە بواری نووسینی مێژوودا. ئەم وەڵامەش زۆر ئاسانە بە هێندەی قەبارەی خۆیان واتە هۆکاری کەم دەرکەوتنیان لەو بوارەدا کەمی ژمارەیانە ئەوان بۆ خۆیان کەمینەن لە کوردستان، بۆیە هێندە زۆرنین بەهێندی کورد یان موسڵمانەکان بەشداربن لە سەرجەم کایەکاندا، هەرچەندە لە هەندێك بواردا بوونی خۆیان سەلماندووە من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم کە ڕێگریان لێ کرابێت بە پێچەوانەشەوە زۆر ڕێگا لەبەردەمیاندا کراوەبووە بەڵام بۆ خۆیان بەهۆی کەمی ژمارەیان نەیانتوانیوە لەسەرجەم بوارەکاندا خەڵکان پێشکەش بکەن، پاشان مێژوونووسی ئەکادیمیش لە وڵاتی ئێمەدا نوێیە واتە هێندە کۆن نییە کە سەرجەم کەمینەو چینەکان بەشداریان تێداکردبێت، هەروەها نابێت ئەوەشمان بیر بچێت کە مەسیحی بە سروشتی خۆی کەمتر لە بواری ئەکادیمی مێژوودا کاردەکەن، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵات ئەمەش لەبەر ئەوەی پیشەی مێژوونووسی لە نێو کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتیەکاندا هێندە گرنگی و بایەخی پێنەدراوە، بۆ نموونە ئەگەر عێراق بەگشتی وەربگرین کامەیە مێژوونووسی دیاری مەسیحی؟ وڵاتێکی وەك میسر کە چەندین زانکۆی زۆر

گەورەی تیادایە و ژمارەیەکی یەکجار زۆریش مەسیحی تیادایە کەچی تەنیا یەك مێژوونووسی دیاری مەسیحی تیادایە ئەویش(جوزیف یوسف نسیم)ـە، بۆیە ئەم بابەتەی ڕۆژهەڵات بەگشتیش ڕەنگدانەوەی بەسەر کوردستاندا هەبووە کە لە کەم دەرکەوتنی مەسیحییەکان لە کایەی نووسینی مێژوو بە ئەکادیمی.

پ٧/ بازاڕی کتێبی مێژووی لە کوردستاندا چۆن دەبینی؟

و/ بە بۆچوونی من بازاڕی کتێبی مێژوویی لە کوردستان هەم گەرمە هەم هەژار، گەرمە لە پڕفرۆشتنی کتێبە مێژووییەکانداو کەم کتێبی مێژوویی هەیە بە زمانی کوردی دەرچووبێت و بە کەمتر لە مانگێك لە بازاڕەکاندا نەمابێت، بەڵام هەژارە لە بەردەم خستنەبازاڕی کتێبەکانەوە کتێبێکی زۆر زۆر کەمی مێژوویی بە چاپ ئەگات، ئەوانەشی کە چاپ دەکرێن هەندێکیان چاپی دووەم و سێیەمی کتێبە کۆنەکانە، یان وەرگێڕانێکی پڕ لە هەڵەی کتێبێکی عارەبی یان فارسی یان ئینگلیزییە (هەرچەندە وەرگێڕی زۆر چاکیش هەیە کە وەرگێڕانەکانیان دانسەقەیە)و کتێبی مێژوویی جدی زۆر بە کەمی چاپ دەکرێت، لەم بوارەدا من ڕەخنە لە مێژوونووسان و ئەکادمیستانی بواری مێژووی لای خۆشمان دەگرم کە نەیانتوانیوە بەشێوازێکی دروست و بەرچاو کتێب و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی جدی بخەنە بازاڕەوە.

پ٨/ بۆچی ئەگەر ئافرەت مافی خوێندنی لە کوردستاندا هەیە بەشداری ئافرەت لەنووسینی مێژووی کورددا لاوازە؟

و/ سەبارەت بەم پرسیارەش بە بۆچوونی من ئەم بابەتە فرە ڕەهەندی هەیە لە چەندین لاوە: لە لایەك کۆمەڵگا ئافرەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا سەرباری ئەوە کە مافی بەردەوامی خوێندن و تەواوکردنی زانکۆ و تەنانەت خوێندنی باڵاشی پێدراوە لە بواری مێژوودا، کەچی جگە لە ماستەرو دکتۆراکەی ئەگەر بە چاپی

بگەیەنێت هیچ بەرهەمی تری نابێت، هۆکاری سەرەکی بۆ ئەم بابەتەش پێگەو ئەرکەکانی ئافرەتە لە کۆمەڵگای کوردی چونکە سەرباری ئەرکی خوێندنەکەی ئەرکی کۆمەڵایەتیشی لەسەرە وەك ماڵ و منداڵ و مێرد، هەروەها تێڕوانینی کۆمەڵگا بۆ ئافرەت کاریگەری لە دوورکەوتنەوەی ئافرەتەکە کردووە لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە کاریگەری لە بەرهەم و نووسینەکانی کردووە ئەمە جگە لەمتمانە بەخۆ نەبوون لە لای زۆرینەی ئافرەتەکان کە بتوانن کاری جدی بکەن لە پیاوان باشتربن لە بواری کارکردن لە ڕاستیدا هەروەك وتم ئێمە لە کوردستان جارێ نوێین لە بواری کارکردن لە بواری مێژوو و نووسینەوەی مێژوودا، من دڵنیام لەگەڵ بەرەوپێش چوون و زیاتر پێشکەوتن ئەو بوارەش پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێت و ئافرەتی زۆر کارامەو دیاریش لە بواری نووسینەوە و کارکردن لە مێژوودا بەدەردەکەون.

پ٩/ ئایا سەردانی مۆزەخانەکانی کوردستانت کردووە؟

و/ بێگومان سەردانی سەرجەم مۆزەخانەکانم لە سەرجەم شارەکانی کوردستان کردووەو کردوومەتە بەرنامەی خۆم هەموو ساڵێك خوێندکارەکانم وەك گەشتی زانستی دەبەم بۆ مۆزەخانەکانی سلێمانی، مۆزەخانەی نیشتمانی(ئەمنە سوورەکە)، مۆزەخانەی شارستانیی هەولێر، مۆزەخانەی کلتووری ناو قەڵای هەولێر.

پ١٠/ لە کاتی خوێندنەوەی مێژووی کورد هەست بە چی دەکەی شانازی کردن یان غەمباربوون یان هەست دەکەی کاری خۆت دەکەی؟

و/ من وەك ئەکادیمییەك ڕەنگە خوێندنەوەم لە کەسی تر جیاوازبێت بۆ مێژوو، بەتایبەتی مێژووی میللەتی خۆم، بێگومان سەرەتا کاری خۆم دەکەم کە پێویستە بەردەوام بخوێنمەوە، پاشان هەندێك جار زۆر دڵخۆشم و هەندێ جار

غەمباری گەورە دەبم، زۆر دڵخۆش دەبم کە من سەر بە میللەتێکم ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە مێژوودا کە نەك تەنیا بە کورد تەنانەت بۆ سەردەم ڕۆژهەلاّت لە چەندین ماوەی مێژوویدا ڕۆڵی گەورەی هەبووە، چەندین پیاو و ئافرەتی مەزنی هەبووە کە مێژوویان بۆ خۆیان و گەلانی تریش دروست کردووە، چەندین زاناو ..تد پایەبەرز هەبووە، بەلاّم غەمبار ئەبم کاتێك دەبینم کورد میللەتێکی پەرت پەرت بووە لەسەر خاکی خۆی زۆر جار بەبێ هۆی ململانێی یەکتریان کردووە، سەرەڕای ئەو هەموو ڕۆڵە گەورەیەی کە هەیبووە ئەو هەموو پێشکەوتنە مەزنەی کە تۆماری کردووە ئەو هەموو زاناو کەسایەتیە بەجەرگانە کەچی تا ئێستا لەسەر خاکی خۆی خاوەنی قەوارەیەك نییە کە سەرجەم ڕۆڵەکانی بگرێتەوە، بەلاّم بەگشتی من هەست بە شانازی دەکەم بە مێژووی میللەتەکەم بە هەموو کەم وکوڕی و ناتەواوییەکانیەوە چونکە سەر بە میللەتێکی ڕەسەنم.

پ١١/ پێت وایە ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆی کوردستان سەرچاوەیەکی باش بێت بۆ مێژوونووس بۆ ئەوەی لە ئایندەدا پشتی پێ ببەستێ بۆ نووسینی مێژووی کورد؟

و/ بێگومان ڕۆژنامەگەری ئەرکی نووسینەوەی مێژوو نییە، بەلاّم دەکرێت مێژوونووس سوود لە ڕۆژنامەگەری وەربگرێت بۆ نووسینەوەی مێژوو وەك بەڵگەیەکیش بەکاری بهێنێت، بۆ نموونە لە سەردەمی شێخ محمود و پاشان بۆ نووسینەوەی بارودۆخی سلێمانی لە سالاّنی بیستەکان و سەرەتاکانی سەدەی بیست باشترین بەڵگەی مێژوویی بۆ ئەو سەردەم ڕۆژنامەکانی ژین و ژیانەوەیە، یان بانگی هەق و تێگەیشتنی ڕاستییە...بۆیە ڕۆژنامەگەری سوودی زۆری هەیە بۆ مێژوونووس بەڵێ بەبۆچوونی من بۆ ئەمڕۆش ڕۆژنامەگەری کوردی سەرچاوەیەکی یەکجار بەنرخ و بایەخە بۆ نووسینەوەی مێژووی کوردستان لە

داهاتوودا، بۆ نموونە ئەگەر باسی کاروچالاکییەکانی حیزبەکان و یان شەڕی ناوخۆیان گوزەران و نرخی شتومەکەکانی خەڵکی کوردستان یان بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ڕووداوەکانی خەڵکی باشووری کوردستان بکەین لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی بیست بێگومان سەرچاوەو بەڵگەی زۆر بەنرخ بۆ ئەو کاتەی مێژوونووس هەردوو ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ و خەبات)ـە کە ڕۆژنامەی ڕۆژانە بوون و ئەو بارودۆخەیان بەوردی باس کردووە، یان لە ئەمڕۆدا کە چەندین ڕۆژنامەگەری ئەهلی و بەناو ئەهلی و حیزبی هەیە لەسەر ڕووداوێکی دیاریکراو چەندین بۆچوون و بیری جیاواز دەردەبڕدرێت کە مێژوونووس لە ئایندە کاتێك ئەرشیفی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە دەردەهێنێت سەرچاوەیەکی فرە بۆچوونی بەنرخی لەبەردەست دەبێت، کە ڕووداوەکانی زۆر ورد بۆ شیکار دەکەن، بۆیە من پێم وایە ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆ یەکێکە لە سەرچاوە زۆر باش و بەنرخەکانی مێژووی کوردستان بۆ مێژوونووسانی ئایندە.

پ١٢/ پێت وایە شتێك هەبێت بە ناوی قوتابخانەی کوردی لە نووسینی مێژوودا؟

و/ ئێمە بەو پێیەی کە لە نووسینەوەی مێژوودا نوێین تەمەنی کۆنترین بەشی مێژوو لە کوردستاندا ناگاتە(٣٠) ساڵ بۆیە لە ڕاستیدا تا ئێستا یەك ڕێچکەمان نەگرتوە، و نەمان توانیوە وەك قوتابخانەیەك دەربکەوین و کاریگەربین بە قوتابخانە گەورەکانی نووسینەوەی مێژوو، وەك عارەبی و فەرەنسی ئینگلیزی ئەویش لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکان وەرمان گرتووە کە دواجار قوتابخانە عەرەبەییەکە بە سەریدا زاڵە.

پ١٣/ بایەخی وێنە لە بواری مێژوودا چییە؟

و/ وێنە بۆ ڕووداوە مێژووییەکان زۆر گرنگ و کاریگەرە بەڵام بڕیاری یەکلاکەرەوە نییە بۆ ئەو ڕووداوە، بە پێوانەی ڤیدیۆ کە زۆر کاریگەرترە، چونکە

بۆ بڕیاردان لە ڕووداوێك ئەگەر پشت تەنیا بە وێنە ببەسترێت بەبێ بوونی بەڵگەی تر ئەوە هەڵەیە وێنە لە کۆن و ئێستاشدا هەرگیز ناتوانێ وێنەی ڕاستەقینەی ڕووداوە مێژووییەکە بدات بە دەستەوە بەتایبەتی بۆ ئێستا کە زۆر ئاسانە دەستکاری ئەو وێنانە بکرێت بە جۆرێ کە هەرگیز هەستی پێ نەکرێت، ئەمە جگە لەوەی کە وێنە دەتوانرێت لە چەندین گۆشەو سووچ و بۆ چەندین مەبەستی جیاواز بگیرێت، بەڵام هەروەك وتم بۆ زۆر شتی تر وێنە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە بۆ نموونە بۆ باسی داهێنراوێکی زانستی یان بۆ باسی کەسایەتییەك تا بیناسێنێ یاخود بۆ باسی ڕێککەوتن نامەیەك و ئەو کەسانەی کە بەشداربوون تیایدا یاخود بۆ سەردانی شوێنێك و گێڕانەوەی مێژوویی ئەو شوێنە یان بۆ بەراوردکردنی شتێك یان شوێنێ لە ڕابردوو و ئێستادا...تد.

پ١٤/ پێت وایە جیاوازی هەبێت لە نێوان زمانی نووسینی مێژوویی و زمانی نووسینی ئەدەبیدا؟

و/ بێگومان جیاوازییەکی یەکجار گەورە هەیە لە نێوان زمانی نووسینی مێژوو و ئەدەبیدا، چونکە مێژوو چیرۆك و ڕۆمان نییە، هەروەك شیعرو دراماو سیناریۆش نییە. مێژوو ڕووداوی ڕاستەقینەی مرۆڤەکانە کە بە شێوازی واقیعی و دوور لە عاتیفەش پێویستە بخرێتەڕوو، ئەمە جگە لەوەی کە پێویستە بەڵگەنامەو سەرچاوەی پێویستی بۆ بخرێتەڕوو تا بابەتەکان دیارو ئاشکرا بێت، بەمەش زمانەکەی جیاواز دەبێت لە زمانی ئەدەبی، بۆ نموونە کتێبی شەرەفنامە، مێژوونووسی گەورە شەرەفخانی بەدلیسی، کاتێك وەرگێڕ کارامە و گەورەی کورد هەژار وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بە بۆچوونی من مانا مێژووییەکەی لەدەست داوە چونکە بە زمانێکی ئەدەبی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی،

بەڵام کاتێک م. جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی دەیکاتە زمانی عارەبی گەلێك بەسوودترە بۆ مێژوونووس چونکە زمانەکەی ئەو زیاتر مێژووییە.

پ١٥/ ڕات چییە بەرامبەر بە مێژووی زارەکی، ئایا لەم بوارەدا کارت کردووە؟

و/ مێژووی زارەکی زۆر بە بایەخە بەتایبەتی بۆ ڕووداوە مێژووییە نادیارەکان بەڵام ئەم مێژووە بە حوکمی ئەوەی ماوەیەکی زۆری بەسەردا ڕۆیشتووە زیاتر قالبی ئەفسانەیی وەردەگرێت هێندە زارە زار دەکات هەرجارەو زیادەی پێوەدەنرێت و لە بوارە مێژووییە ڕاستەکەی دوور دەکەوێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە زیاتر چوارچێوەی فۆلکلۆر و کلتووری گەلان وەردەگرێت کە بۆ گەرمکردنی کۆڕو مەجلیسان سوودی دەبێت کە زیاتر لە بواری ئەدەبیدا خۆی دەبینێتەوەو دەچێتە چوارچێوەی چیرۆك و ئەدەب، بۆیە بە بۆچوونی من ناکرێت وەك مێژوو سەیری بکەین، چونکە هەروەك وتمان مێژوو پێویستی بە نووسینەوەو بەڵگە هەیە بۆیە ئەگەر نووسینێك یان بەڵگەیەك نەبێت ئەم مێژووە پشت ڕاست بکاتەوە ئەوا دەتوانین بڵێین لە چوارچێوەی مێژوو دەردەچێت و زیاتر ئەدەبی دەبێت وەك چیرۆك و ڕۆمان، بۆیە من لەم بوارەدا کارم نەکردووە.

پ١٦/ پێت وایە مێژوونووسی بێ لایەن هەبێت؟

و/ بێگومان مێژووونووسی بێ لایەن هەیە، دەتوانین بڵێین سەرجەم مێژوونووسانی ئەکادیمی بێلایەنن چونکە ئەرکی ئەو وەهایە کە بەو جۆرەبن و ئەگەر وانە بن لە ئەکادیمی بوون دەردەچن، پاشان ئەمە مانای ئەوە نییە کە مێژوونووسی بێ لایەن لە دەرەوەی ئەکادیمیەکانیش نەبێت، بەڵێ بێگومان پێم وایە کە مێژوونووسی بێ لایەن هەیە.

پ١٧/ مێژوو هەر سوودی هەیە یان زیانیشی هەیە؟

و/ لە ڕاستیدا هەموو شتێك دوو لایەنە لە ژیانی مرۆڤەکان بەڵام بەپێی جۆرو ئەو شتە لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر دەگۆڕێت، مێژووش یەکێکە لەو بابەتانەی کە هەردوو لایەنی هەیە بەڵام بە بۆچوونی من سوودی گەلێك زیاتر وەك لە زیان چونکە من پێم وایە (مێژوو ئاوێنەی ڕابردووە بۆ ڕووناك کردنەوەی داهاتوو)، بەڵام بێ زیانیش نییە بۆ هەندێك کەس بەتایبەتی کە ڕابردوویان بریتی بێت لە کاری نابەجێ و بۆ خەڵکی بخرێتەڕوو کە ئەمە زیانی بۆ کەسەکە هەیەو سوودی بۆ گشت، کەواتە دواجار مێژوو سوودی گەلێك زیاتر لە زیان و سوودمەندە.

پ١٨/ پێت وایە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی کوردستان وەکو پێویست بایەخیان بە بواری مێژوو داوە؟

و/ من پێم وایە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان و تەنانەت ڕۆژنامەو گۆڤارەکان زۆر بە کەمی گرنگیان بە بابەتی مێژوو داوە چەند کەناڵێکی زۆر کەم نەبێت ئەوانی تر باسی مێژوو هەر ناکەن، کە دەبوایە چەندین بەرنامەو گۆشەیان تایبەت بکردایە بۆ باسی مێژووی هەم کورد و هەم هەموو جیهان بەگشتی تا تاکی کورد زیاتر بەرچاو ڕوون بێت لەو بوارەدا، بەڵام بەداخەوە ئەمە نەکراوە.

پ١٩/ وێنەی هیچ کەسایەتییەکی مێژوویيت لەماڵەوە هەڵواسیووە؟

و/ بەڵێ وێنەی مێژوونووسی گەورەی کورد شەرەفخانی بەدلیسی.

پ٢٠/ چۆن بایەخی وەرگێڕان لە بواری مێژوودا دەبینی؟

و/ وەرگێڕان دوو جۆرە (وەرگێڕانی حەرفی وەرگێڕانی مانایی) مێژوو یەکێکە لەو بابەتانەی هەرگیز بە وەرگێڕانی حەرفی ناتوانرێت ئەو مانایەی خۆی بەدەستەوە

بدات کە هەیەتی، هەروەها پێویستە ئەو کەسەی کە مێژوو وەردەگێڕێت خۆی پسپۆڕ بێت لە بواری مێژوودا، و ئاگاداربێت لە ڕووداوەکان، بێگومان وەرگێران بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە بۆ بابەتی مێژوو، و ئاگاداربوونە لە مێژووی گەلانی تر، هەروەها ئاگاداربوونە لەو نووسینانەی کە خەڵکانی تر لەسەر مێژووی تۆ کردوویانە. جگە لەوەی بە زمانەکانی تر لێکۆڵینەوەی زۆر بە بایەخ هەیە کە ئەنجام دراوە لە بواری مێژوودا ئەگەر وەربگێڕدرێت خوێنەری کورد سوودی زۆری لێ وەردەگرێت، بەڵام بەداخەوە زۆرینەی ئەو بابەتە مێژووییانەی کە وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی کوردی یان کەسانی ناپسپۆڕ ئەنجامی ئەدەن یان وەرگێڕانێکی حەرفییە بۆیە ماناکەی تێک دەدەن و زۆر هەڵەی تیادا بەدیدەکرێت.

پ٢١/ لەگەڵ ئەوەی مۆزەخانەی ئەهلی لە کوردستاندا بکرێتەوە؟

و/ بەڵێ لەگەڵ ئەوەدام بەڵام بە مەرجێ ئەو شوێنەوارو کلتوور و کەلەپوورەی کە تێیدا نیشان ئەدرێ بۆ فرۆشتن نەبێت بەڵکو تەنیا بۆ نیشاندان بێت و کەسانی تایبەتمەند بەڕێوەی بەرن، بەمەش کارێکی گرنگ و گەورە ئەنجام دەدرێت تەنانەت من لەگەڵ ئەوەدام کە شێوە مۆزەخانە بۆ شتی تریش بکرێتەوە بۆ نموونە مۆزەخانەی کەسایەتییە ناودارەکانی کورد کە پەیکەریان بە سلیکۆن بۆ دروست بکرێت، یان جلوبەرگ و مۆزەخانەی کلتووری.

پ٢٢/ بۆ پتر خزمەتکردنی مێژووی کورد پێشنیاری چی دەکەی؟

و/ بۆ پتر خزمەتکردنی مێژووی کورد پێشنیار دەکەین: کە سەندیکایەکی تایبەتمەند یان یەکێتیەکی تایبەتمەند دروست بکرێت کە سەرجەم مێژوونووسان

و پسپۆڕانی بواری مێژوو کۆبکاتەوە لە سەرجەم شارو شارۆچکەکان لقی هەبێت، هەروەها لەم ڕێگایەوە گۆڤارێکی تایبەتمەند دەربکرێت کە تیایدا چەندین مەلەف پێشنیار بکرێت لەسەر بابەتەکانی مێژووی کورد بخرێتە بەرچاو داوابکرێت کە لێکۆڵینەوەی تیادا ئەنجام بدرێت، هەروەها هانی مێژوونووسان بدرێت کە لەسەر بابەتە جیاوازەکانی مێژووی کورد لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن ئەمەش بە هاندان و دەستخۆشانەو ڕێزلێنان ئەبێت، هەروەها بەردەوام لەو یەکێتییە پێشنیارکراوە هەفتانە کۆڕو سیمینار بۆ ئەندامەکانی ئەنجام بدرێت و لە کەناڵەکانەوە پێشکەش بکرێت کە لەو کۆڕانەدا چارەسەری بابەتەکانی مێژووی کورد بکرێت بە گشتی.

پ٢٣/ ئایا مێژوونووسانی کورد لەبەر پوخت نووسی یان لەبەر کەم کاتی کەم دەنووسن؟

و/ لە ڕاستیدا لەبەر خزمەت نەکردنیان و بەدەمەوە نەبوونیان، هەروەك لە خاڵی سەروو ئاماژەمان پێکرد بە گشتی ڕێکخراوێك نییە کە مێژوونووسان کۆبکاتەوەو هانیان بدات و بەرهەمەکانیان بۆ چاپ بکرێت ئەمەش وا دەکات کە مێژوونووس ساردببێتەوە لە ئەرکەکانی کاتێ بزانێت بە تەنیایەو کەس نییە هانی بدات و پشتگیریی لێ بکات و هەروەها بەرهەمەکانی بڵاوبکاتەوە، چونکە خەڵکی لای ئێمە کاتێ بابەتێك دەنووسێ یان ئەبێت لەسەر گیرفانی خۆی چاپی بکات یان ئەبێت لە دەرگای هەرچی دەزگای چاپ هەیە بدات ئەوانیش بە کەیفی خۆیان سووکایەتی بە بەرهەمەکەی دەکەن و ئەیهێنن و ئەیبەن و پاشان ئەگەر بڕیار

بدەن بۆی چاپ بکەن... ئەمەش بە ڕاستی مێژوونووس لە نووسین سارد دەکاتەوە.

پ٢٤/ لە هیچ نوسینێکی خۆت پەشیمانی؟

و/ نەخێر، بە پێچەوانەوە ئەو بەرهەمانەی کە هەمن شانازیان پێوە دەکەم.

پ٢٥/ ئایا دراوسێکانی کورد هەر مێژووی کوردیان چەواشەکردووە یان خزمەتیشیان کردووە؟

و/ لە ڕاستیدا دوو جۆر بابەت هەیە تایبەتە بە دراوسێکانی کورد ئەویش سیاسی و ئەکادیمی ئەم پرسیارە زۆر گشتگیرەو بۆ خۆی پێویست بە چەند لاپەڕە وەڵام دانەوە ئەکات، چونکە ئەبێت سەرەتا بزانین دراوسێکانی کورد کێن و بەکێ دەڵێن دراوسێی کوردو بۆ خۆیان بۆ مێژوو چیان کردووە، ئایا سرووشتی مێژوو نووسینەوە لای ئەوان چۆنە و چییە؟ بەلام بە شێوەیەکی سەرزارەکی و بەو شێوەیەی کە بەڕێزتان ئەڵێن ئاسان نییە وەڵام بدرێتەوە، بەهەرحاڵ ئێمە پێمان وایە ئەوانەی کە لە چوارچێوەی سیاسەتێکی شۆڤینی کاردەکەن و بەتایبەتی لە دوای سەدەی نۆزدەوە ئەم کارە زیاتر پەرەی سەندووە، بەلام ناتوانین بڵێین کە سەرجەم ئەمانەش مێژووی کوردیان چەواشەکردووە چونکە نموونەی زۆر بەرزو جوانمان هەیە کە باسی کورد و مێژووەکەی دەکەن بۆ نموونە(رسول کرکوکلی لە کتێبی دوحة الوزراء یان اولیا چلبی لە کتێبی سیاحەت نامەکەی و هەروەها حبیب الله تابانی لە کتێبی مێژووی کورد و ماد... چەندانی تر) کە زۆر بە لایەنێکی جوان و ئینسافەوە لە مێژووی کورد دواون.

پ٢٦/ چۆن وەڵامی ئەو کەسانە دەدەیتەوە کە مێژوو بە درۆ دەزانن؟

و/ لە ڕاستیدا پەتی درۆ کورتە درۆش لە نێو کاری مێژوودا جێگای نابێتەوە، ئەگەر ئەمڕۆش بابەتێك بە درۆ تۆمار بکرێت یان خەڵکی پێ چەواشە بکرێت سبەی ڕۆژ هەر بە درۆ بخرێتەوە، لێرەدا ئەچمە پاڵ بۆچوونەکانی مێژوونووسی گەورەی کورد(د.کەمال مەزهەر) سەبارەت بەو بابەتە کە لە کتێبی(مێژوو)دا تۆماری کردووە، کە چەند نموونەیەکی هێناوەتەوە یەکێك لەو نموونانە دەڵێت: ((لە سەردەمی ناپلیۆن دا ئەفسەرێك لە جەنگ دا کوژرا کاتێ هەواڵیان بۆ هێنا پێیان وت فلانە ئەفسەر کوژراوە، ئەویش وتی کاتێ مرد وتی چی وتیان قوربان لەبەر ئازار هیچی نەوت و مرد ئەویش وتی دەبنووسن تا ڕوحی دەرچووە وتویەتی بژی ناپلیۆن، بەلام ئایا ئەمە بۆی چووە سەر ڕەنگە چەند دەیەیەك ئەمە نووسرابێت لە مێژوودا بەلام مێژوونووسی نوێ هات و بە بەلگە و سەرچاوەی نوێ ئەو بابەتەی بەدرۆ خستەوە، بۆیە درۆ لە نێو مێژوودا جێگای نابێتەوە ئەگەر ئەمڕۆش دەرنەخرێت دواجار بە گەڕان و لێکۆڵینەوەو پەیجویی وردی مێژوونووسان دەخرێتەڕوو.

پ٢٧/ لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانی مێژوو کامە پێناسە بە گونجاوتر دەزانی؟

و/ لە ڕاستیدا من وەك خۆم پێناسەیەکم هەیە بۆ مێژوو و باوەڕم پێیەتی ئەویش ئەوەیە کە ((مێژوو ئاوێنەی ڕابردووە کە داهاتووی پێ ڕۆشن ئەبێتەوە)).

پ٢٨/ ئایا دایك و باوکت خوێندەوار بوون؟

و/ بەڵێ.

پ٢٩/ ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەی ماڵەوە چەندە؟

و/ لە ڕاستیدا من دوو جۆر کتێب بەکاردەهێنم کتێبی ئاسایی و کتێبی ئەلکترۆنی کتێبە ئاساییەکانی ناو کتێبخانەی خۆم لە ماڵەوە نزیکەی(١٧٠٠) کتێبە زیاتر بە زمانی عارەبی پاشان کوردی پاشان فارسی و پاشان ئینگلیزین بە کتێب و گۆڤارەوە، کتێبی ئەلکترۆنیش لە کۆمپیوتەرەکەم زیاتر لە (١٠٠٠٠)دەهەزار کتێبم هەیە کە بەردەوام بۆ خۆم و خوێندکارەکانم سوودی لێ وەردەگرم بەهەمان زمانانی پێشوون کە ئاماژەم پێکردن.

لە کۆتایدا زۆر سوپاس بۆ ئەو پرسیارانە هیوادارم وەڵامەکانم جێگەی خۆی بگرێت و ببێتە مایەی سوود بۆ هەموو لایەك...

زریان حاجی

مامۆستا لە بەشی مێژووی کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی.

